# چێژی نوێژ

## - ئیبن قەییم -

کۆکردنەوەو ئامادەکردنی

عادل عبدالشكور

وەرگێڕانی

ئەیاد فەهمی

# پێشەکی

الحمد لله رب العالمین، والصلاة والسلام علی أشرف النبیین و المرسلین، وعلی آله وصحبه و سلم تسلیما کثیرا، وبعد:

ئەمە بابەتێکی بەنرخە لە بەشێکی ناسکدا، کە ئیبن قەییم تێیدا باسی نوێژی کردووە لە چەند شوێنێکی کتێبەکانیدا، بە ڕێگایەکی نوێ، ئەوەندەی من بزانم کەس پێش ئەم بەم جۆرە لە بارەیەوە نەدواوە، لە بارەی کرۆک و ناوەرۆکی نوێژەوە دواوە، کە ئەویش خشوعە، لە تەکبیرەی ئیحرامەوە هەتا سەلامدانەوە، تێیدا چەندین شتی سەرسووڕهێنەر و بەسوودی باس کردووە.

**بەشی یەکەم:** لە ناو ئەو کتێبانەدا باسی کردووە کە باس لە بابەتی سەماع[1] دەکات، لە کۆتاییەکەیدا دەفەرمووێت:

(ئەمە ئاماژەیەک و پوختەیەک بوو لە چێژی نوێژدا).

**بەشی دووەم:** لە کتێبی (الصلاة و حکم تارکها)دا هاتووە، ئەم بەشەی لەنێوان پەڕەکانی کتێبەکەدا ون و نادیار بوو، هەر بۆیە زۆر بەسوود

---

(١) بابەتی سەماع، مەبەست لێی گوێگرتنە لە گۆرانیی قەدەغەکراو، ئیبن قەییم لە کتێبێکی تایبەتدا باسی ئەمەی کردووە بە ناوی: (الکلام علی مسألة السماع) کە فراوانترین کتێبە لەو باسەدا، لە کتێبەکەدا هەموو بەڵگەکانی ئەوانەی باس کردووە کە بە دروستی دەزانن و دواتر بەدرێژی موناقەشەی بەڵگەکانی کردوون و وەڵامی داونەتەوە، بۆچوونی هەموو زانایان و وەڵامدانەوەیانی تێدا جەم کردووە، لە چەند کتێبێکی تریشدا لە بارەیەوە دواوە، لەوانە، (إغاثة اللهفان، مدارج السالکین). (وەرگێڕ)

بوو کە بەتەنها لە شوێنێکدا دابنرێت بۆ ئەوەی سەرجەم موسڵمانان سوودی لێ ببینن، منیش بەپێی بڕگەکانی ناوونیشانی گونجاوم بۆی داناوە.

بەشی سێیەم: پەیامێکی ئیبن قەییمە بۆ یەکێک لە هاوڕێکانی.

ئیبن قەییم لە ئیبنو تەیمییەی مامۆستایەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:

(گەر دوای کردەوەیەکی چاکە هەستت بە کرانەوە و چێژ نەکرد لە دڵتدا، ئەوا گومانی لێ بکە، چوونکە پەروەردگارت شوکرانەبژێرە).

ئیبن قەییم لەسەر ئەم وتەیە دەڵێت: (واتە ئەو کەسەی کردەوەی چاکە دەکات هەر لە دونیادا پاداشتەکەی وەر دەگرێت بە چێژێک لە دڵیدا و گەشانەوە و چاوگەشبوون پێی، گەر هەست بەم چێژە نەکات، ئەوا کردەوەکەی ناتەواوە).[1]

---

(١) تەنها ئەم پێشەکییە لە نووسینی عادل عبدالشکورە، ئەوەی تری هەموو نووسینی ئیبن قەییمە و ئەم مامۆستا بەڕێزە لەم کتێبەدا کۆی کردووەتەوە، وەک چۆن بەڕێزیان ئاماژەیان پێ دا. (وەرگێڕ)

## ئیبن قەییم لە بارەی نوێژەوە ئاوا دەفەرمووێت

### حەقیقەتی نوێژ

گومانی تێدا نییە نوێژ نووری دیدەی خۆشەویستانە، چێژی ڕۆحیی یەکخواناسەکانە، تاقیکردنەوەی دۆخی ڕاستگۆیانە، تەرازووە بۆ ئەوانەی ڕێگایان گرتووەتە بەر، ڕەحمەتێکی ئارامبەخشە بۆ بەندەکانی، ڕێنوێنیی کردوون بۆی و پێی ناساندوون وەک میهرەبانی و ڕێزێک بۆیان، بۆ ئەوەی بەهرەمەند بن لە میهرەکەی و نزیکی لە ئەو بەدەست بهێنن. پێویستی بە بەندەکانی نییە، بەڵکوو بە فەزڵ و منەتی خۆی نوێژی بۆ داناون؛ پەرستشە بۆ دڵ و هەموو ئەندامەکان، بەشی دڵ تێیدا کاملترین و مەزنترین بەشە، نوێژ ڕووکردنەخودایە، دڵخۆشی و چێژوەرگرتنە بە نزیکی لە خودا و دڵخۆشبوون بە خۆشەویستییەکەی، شادومانبوونە بە وەستان لە بەردەمیدا و ڕووکردنە ئەو و پشتکردنە غەیری ئەو، بەجێگایەندنی مافی بەندایەتییە هەتا بەو شێوەیە دەبێت کە پێی ڕازییە.

## نوێژ میوانداری و بارانە

کاتێک خودا بەندەکەی تاقی کردوەتەوە بە ئارەزووەکانی لەگەڵ هۆکارەکانیدا لە ناخی خۆی و دەرەوەیدا، ڕەحم و چاکەی خودا بە بەندەکەی ئەوەی خواستووە کە خوانێکی بۆ ساز بکات کە هەموو جۆرە ڕەنگ و دیاری و بەرگی شانازی و بەخششێک لەخۆی بگرێت، ڕۆژانە پێنج جار بانگهێشتی کردووە بۆی، هەر ڕەنگێک لە ڕەنگەکانی خوانەکەی کردووە بە چێژ و سوود و بەرژەوەندییەک -بۆ ئەو بەندەیەی بانگهێشتی ئەم خوانە کراوە- کە لە ڕەنگەکانی تردا بوونی نییە؛ بۆ ئەوەی بەندە چێژ لە هەموو ڕەنگەکانی بەندایەتی وەر بگرێت، بە هەموو جۆرەکانی ڕێزلێنان ڕێزی لێ بنێت، هەر کردەوەیەک لە کردەوەکانی ئەو بەندایەتییە دەبێتە هۆی سڕینەوەی تاوانێک کە ئەنجامی داوە، بۆ ئەوەی پاداشتی بداتەوە بە نورێکی تایبەت و بەهێزییەک لە دڵ و ئەندامەکانیدا، پاداشتێکی تایبەتیش لە ڕۆژی پەسڵاندا.

## دەرچوون لە میوانداریییەکە

بانگهێشتکراوەکە لە میوانداریییەکە دەر دەچێت بە تێری و تێراوی، پۆشاکی قبوڵبوونی کردووەتە بەری و بێپێویستی کردووە لە هەموو شتێک، چوونکە پێش ئەمە دڵ تووشی بێئاوی و نەهاتی و برسێتی و تینوێتی و ڕووتی و نەخۆشی هاتبوو، ئەو دەمەی لە میوانداریییەکە دەر دەچێت، خودا بەهرەمەندی کردووە لە خواردن و خواردنەوە و پۆشاک و دیاری، کە بێپێویستی دەکات لە هەموو شتێک.

## نوێکردنەوەی میوانداریییەکە

لەبەر ئەوەی نەهاتییەکە بەردەوامە، وشکی و بێفەڕیی دەروون بەردەوامە، وەک ڕەحمەتێک بە بەندەکەی خودا سات لەدوای سات میوانداریییەکەی بۆ نوێ کردووەتەوە، بەردەوام داوای باران دەکات لەو زاتەی باران و ئاودانیی دڵی بەدەستە، داوای هەوری ڕەحمەتی ئەو زاتە دەکات؛ بۆ ئەوەی پاوەن و گیا و بەروبوومی ئیمانەکەی وشک نەکات کە نوێژ گەشەی پێ کردووە، بۆئەوەی ماکی گیا و دڵەکە نەبڕێت لە داواکردنی ئاودان و باران، بەم شێوەیە بەردەوام سکاڵای بێئاوی و وشکەساڵی و پێویستبوونی بە ئاودان و بارانی چاکەکانی دەباتە لای خودا، ئەمە دابونەریتی بەندەیە لە ڕۆژەکانی ژیانیدا.

## بێئاگایی وشکەساڵییە

ئەو بێئاگاییەی دڵ داگیر دەکات، وشکەساڵی و بێئاوییە، هەتا یادی خودا بکات و ڕوو بکاتە ئەو زاتە، بارانی ڕەحمەت بەلێزمە دەبارێت بەسەریدا، ئەو دەمەی بێئاگا دەبێت، تووشی بێئاوی دەبێت بە ئەندازەی بێئاگابوونەکەی، کە بێئاگایی شوێنی خۆی دەکاتەوە، دەبێتە زەوییەکی مردوو، ڕووتەنی و بێگژوگیایی دادەبارێتە سەری، ئاگری شەهەوات لە هەموو لایەکەوە دەوری دەدات وەک بای گڕە.

## سەرئەنجامی بێئاگایی

ئەو دەمەی بارانی ڕەحمەتی پێ دەگات، زەوییەکەی دادەچڵەکێت و دەلەرزێت و تۆوەکان چەکەرە دەکەن، ئەوسا لە هەموو جۆرە گژوگیا و گوڵ و گوڵزارێکی جوان جووت دەڕوێت، گەر وشکەساڵی و بێئاگایی پێی بگات، وەک دارێک وایە کە تەڕی و نەرمی و بەروبوومەکەی بە هۆی ئاوەوەیە، هەردەمێک ئاوی لێ ببڕێت، دەمارەکانی وشک دەبێت و چڵەکانی دەپووکێتەوە، لە بەروبووم دەوەستێت، لەوەیە درەختەکە بەتەواوی وشک ببێت، گەر چڵێکی ڕابکێشیت بەرەو خۆت بەدەستەوە نەیەت و ملکەچ نەبێت و بشکێت، ئەو دەمە دانایی خاوەن بێستانەکە ئەوە دەخوازێت دارەکە ببڕێت و بیکاتە کەرەستەی سووتەمەنی.

## وشکبوونی دڵ

دڵیش بەو شێوەیەیە، وشک دەبێت لەو دەمەی بەتاڵ دەبێت لە یەکخواناسی و خۆشەویستیی خودا و ناسینی و یادکردنی و دوعاکردن، گەرمیی دەروون و ئاگری شەهەوات لێی دەدات، بەمەش ئەندامەکانی لە گەشەکردن و ملکەچبوون دەخات، دواتر ئەم و درەختەکە تەنها بۆ سووتان دەست دەدات. ﴿ أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٖ مِّن رَّبِّهِۦۚ فَوَيۡلٞ لِّلۡقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴾[١]

واتە: جا ئایا ئەو کەسەی کە خوای میهرەبان سینەی گوشاد کردووە بۆ ئیسلام و لەسەر ڕێبازی نور و ڕووناکیی پەروەردگاریەتی، (وەک ئەو کەسە وایە کە پێچەوانەیە؟) هاوار و وەیل بۆ ئەوانەی کە دڵیان ڕەقە لە ئاستی قورئان و یادی خودادا، ئا ئەوانە لە گومڕاییەکی ئاشکرادا گیریان خواردووە.

---

(١) سورة الزمر، الآية: ٢٢

## بارانی دڵ

گەر دڵ بارانی ڕەحمەتی بەسەردا بباریت، چڵەکانی نەرم و تەڕ و ملکەچ دەبن، گەر ڕای بکێشیت بەرەو فەرمانێکی خودا، ملکەچت دەبێت، بەخێرایی و بەنەرمی دێت بەدەستەوە، بەروبوومی بەندایەتییەکەی دەچنیتەوە لە هەر چڵێک لەو چڵانە، کە ماکەکەی لە تەڕیی دڵەوەیە، ماکەکە کاری خۆی دەکات لە دڵ و ئەندامەکاندا، ئەو دەمەی دڵ وشک دەبێت، چڵەکانیش لە کاری چاکە دەوەستن، چوونکە ماکی دڵ و ژیانەکەی لێ دابڕاوە و لە ئەندامەکاندا بڵاو نەبووەتەوە، هەر ئەندامێک بەروبوومی خۆی هەڵگرتووە لە بەندایەتیکردن.

## بەکارهێنانی ئەندامەکان

هەموو ئەندامەکانی جەستە پەرستشێکی تایبەتیان هەیە، تاعەتێکیان لێ داوا کراوە، لە پێناو ئەوەدا ئافرێنراوە و ئامادە کراوە بۆی.

خەڵکی لەمەدا سێ بەشن:

**یەکەم:** ئەو کەسەی ئەندامەکانی لەوەدا بەکار دەهێنێت کە بۆی ئافرێندراوە و داوای لێ کراوە، ئەمە ئەو کەسەیە بازرگانیی لەگەڵ خودادا کردووە، کە پڕقازانجترین بازرگانییە، نەفسی فرۆشتووە بە خودا و باشترین مامەڵەی کردووە، نوێژ بۆ ئەوە دانراوە هەموو ئەندامەکان بۆ پەرستش بەکار بهێنرێت لەگەڵ شوێنکەوتنی دڵدا.

**دووەم:** ئەو کەسەی ئەندامەکانی لە شتانێکدا بەکار دەهێنێت کە خودی خۆی و ئەندامەکانی بۆ ئەوە نەئافرێندراون، ئەمە ڕەنجبەخەسارە و بازرگانییەکەی شکستخواردووە، ڕازیبوونی خودا و پاداشتەکەی لەدەست داوە، تووڕەیی و سزای سەختی خودای بەدەست هێناوە.

**سێیەم:** ئەو کەسەی ئەندامەکانی لەکار خستووە و بەبێکاری مراندوویەتی، ئەمەش ڕەنجبەخەسارە بە خراپترین شێوە، مرۆڤ بۆ عیبادەت و تاعەت هێنراوەتە بوون نەک بۆ بێکاری، بوغزاویترین کەس لەلای خودا ئەو کەسە بێکارەیە کە نە لە دونیادا کارێک دەکات، نە مشوری قیامەتیشی دەخوات، ئەمە بارە بەسەر دونیا و دینەوە.

## ئەندامەکانی تاعەت

نموونەی کەسی یەکەم وەک ئەو پیاوە وایە کە زەوییەکی فراوانی کێڵاوە بە یارمەتیی کەرەستەی کێڵان و تۆوکردن، بەشی ئاودانی پێویستیشی بۆ دابین کردووە، کێڵاویەتی و ئامادەی کردووە بۆ کشتوکاڵکردن، جۆرەها بەرهەمی دانەوێڵەی تێدا چاندووە، لەگەڵ جۆرەها میوەهات و بەروبوومدا، دوای ئەمانەیش فەرامۆشی نەکردووە، بەڵکوو پاسەوانی بۆ داناوە و پاراستوویەتی لە تێکدەرەکان، ڕۆژانەیش سەردانی دەکات و ئەوەی خراپ بووە چاکی دەکات، لەبری ئەوەی وشک بووە شتی نوێ دەچێنێت، دڕکەکەی لێ دەکاتەوە و بە بەردارەکان ئاوەدانی دەکاتەوە.

## ئەندامەکانی تاوان

دووەمیش وەک ئەو کەسە وایە هەمان زەویی وەر گرتووە، بەڵام کردوویەتی بە پەناگەی جڕوجانەوەر و شوێنی لاک و بۆگەنی، کردوویەتی بە قەلایەک و پەنای هەرچیی خراپەکار و دز و بەدخوو هەیە داویەتی، ئەوەی دانراوە بۆ تۆوکردن و چاککردنی، ئەم کردوویەتی بە بژێوی و هاوکاری بۆ ئەوانەی تێیدان لە ئەهلی شەڕ و خراپەکاری.

## ئەندامەکانی بێکاری

سێیەمیش وەک ئەو کەسە وایە لەکاری خستووە و فەرامۆشی کردووە، ئاوەکەی بەفیڕۆ داوە لەو دەشت و بیابانەدا، بە پەشیمانی و لۆمەکراوی دانیشتووە.

ئەمە نموونەی بێئاگاکانە، ئەوەی پێشتر نموونەی خیانەتکار و تاوانبارەکان بوو، یەکەمیش نموونەی بەئاگا و هۆشیارەکان بوو کە ئامادەن بۆ ئەو شتەی بۆی ئافرێندراون.

یەکەم: گەر بجووڵێت یان بوەستێت، هەستێت یان دانیشێت، بخوات یان بخواتەوە، بخەوێت یان پۆشاک بکاتە بەری، قسە بکات یان بێدەنگ بێت، هەموو ئەمانە پاداشتە بۆی نەک سزا، لە زیکر و تاعەت و نزیکبوونەوەدایە.

دووەم: گەر ئەو شتانە بکات لەسەری هەژمارە، لە دوورکەوتنەوە و دووری و خەسارەتدایە.

سێیەم: گەر ئەو شتانە بکات لە بێئاگایی و بێکاری و کەمتەرخەمیدایە.

یەکەم: لە تاعەت و نزیکبوونەوەدایە.

دووەم: بە هۆی کارەکەیەوە حوکمی خیانەت و سنووربەزاندنی هەیە، چوونکە خودا ئەو شتانەی پێ نەبەخشیوە بۆ ئەوەی بەو شتانە سەرپێچیی بکات، ئەم کەسە تاوانبارە و خیانەتی لە خودا کردووە لە نیعمەتەکانیدا، شایانی سزایە چوونکە ئەو شتانەی لە غەیری تاعەتی ئەودا بەکار هێناوە.

سێیەم: لەوەدا سوورِ دەخوات و حوکمی بێئاگایی و شادومانیی نەفس و سروشتەکەی دەیگرێتەوە، ئەمەی بەکار نەهێناوە بۆ ڕازیبوونی

خودا و نزیکبوونەوە لێی، ئەمە خەسارەتمەندییەکی ئاشکرایە، کە کاتەکانی تەمەنی لە هیچ شتێکدا خەرج نەکرد و دوور بوو لە باشترین قازانج و ئەزموونەکان.

خودا یەکخواناسەکانی بانگهێشت کردووە بۆ ئەم پێنج نوێژە وەک ڕەحمەتێک بۆیان، جۆرەها عیبادەتی بۆ ساز کردوون، بۆ ئەوەی بەندە لە هەموو وتە و کردەوە و جووڵە و وەستانێک بەشی خۆی ببات لە بەخششەکانی.

## شاندی پاشا

ڕاز و کرۆکی نوێژ ئەوەیە کە دڵ ڕوو بکاتە خودا و هەموو بوونی لە بەردەمیدا ئامادەیی هەبێت، گەر ڕووی تێ نەکات و بە گفتی دەروون و شتی ترەوە خۆی قاڵ بکات، وەک شاندێک وایە کە هاتووە بۆ بەردەم دەرگای پاشا بۆ ئەوەی داوای لێبوردن بکات لە هەڵە و پێخلیسکانەکانی، داوای هەوری بەخشندەیی و میهری بکات، داوای ئەوە بکات کە دڵی پتەو دەکات، بۆ ئەوەی بتوانێت بەباشی خزمەتی بکات، هەر کە گەیشتە بەردەم دەرگاکە و تەنها قسەکردن لەگەڵ پاشادا مایەوە، ڕووی لە پاشا وەر گێڕا و بە ڕاست و چەپدا ڕۆیشت، خۆی قاڵ کرد بە شتانێک کە خراپترین شتە لەلای پاشا، لە ئەویش بەهای کەمترە، پێش ئەوی خست و بە دڵ ڕووی کردە ئەو شتە، کردی بە ڕووگە و شوێنی ڕاز و نهێنیی خۆی، خزمەتکارەکانی نارد بۆ ئەوەی گوێڕایەڵیی پاشا بکەن، داوای لێبوردنی لێ بکەن و لەبریی ئەو خزمەتی بکەن، پاشایش ئەمە دەبینێت و ئاگای لە حاڵیەتی.

## بەخشندەیی پاشا

لەگەڵ ئەمەیشدا بەخشندەیی و سەخاوەت و فراوانیی چاکەی پاشا ڕەتی دەکاتەوە کە ئەم خزمەتکار و شوێنکەوتووانە بە دەستی بەتاڵ بگەڕێنەوە، لە ڕەحمەت و چاکەی خۆی بێبەشیان ناکات.

بەڵام جیاوازی زۆرە لەنێوان ئەو کەسەی لە کاتی دابەشکردنی غەنیمەتدا خاوەن بەشی تەواوە، لەگەڵ ئەو کەسەی بەشێکی کەمی پێ دەدرێت و بەشی تایبەتی نییە. ﴿ وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا عَمِلُواْ وَلِيُوَفِّيَهُمْ أَعْمَٰلَهُمْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾[١]

واتە: بۆ هەریەک لەوانە پلەوپایە هەیە بە گوێرەی کردەوەکانیان، تا خودا پاداشت و سزای کردەوەکانیان بەتەواوی بداتەوە، ئەوان هیچ جۆرە ستەمێکیان لێ ناکرێت.

خودا ئەم جۆرە مرۆڤەی بۆ خۆی ئافراندووە و تایبەتی کردووە و هەموو شتێکی بۆ ئافراندووە، وەک چۆن لە فەرموودەیەکی قودسیدا هاتووە:

(ئەی نەوەی ئادەم، بۆ خۆمم ئافراندوویت و هەموو شتێکم بۆت ئافراندووە، خۆت قاڵ مەکە بەو شتەی بۆم دروست کردوویت، لەو شتەی بۆ ئەوەم دروست کردوویت.)

لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: (بۆ خۆمم ئافراندوویت، گەرەنتیی ڕۆزیەکەتم کردووە، خۆت ماندوو مەکە، ئەی نەوەی ئادەم، بەدوامدا بگەڕێ من دەبینیتەوە، گەر من ببینیتەوە، هەموو شتێکت دەست کەوتووە، گەر منت لەدەست بچێت، هەموو شتێکت لەدەست چووە، من باشترم لە هەموو شتێک).

---

(١)سورة الأحقاف، الآية: ١٩

## هۆکاری نزیکبوونەوە

خودا نوێژی کردووە بە هۆکارێک بۆ ئەوەی بگەین بە نزیکی لە ئەو و موناجاتکردنی و خۆشویستنی و شادومانبوون پێی، بەندە لەنێوان نوێژەکاندا تووشی بێئاگایی و وشکی و دوورکەوتنەوە و پێخلیسکان و هەڵە دەبێت، ئەمەیش لە پەروەردگاری دووری دەخاتەوە، لە نزیکبوون لێی دووری دەخاتەوە، دەبێتە بێگانەیەک لە بەندایەتیکردن وەک ئەوەی لە گرۆی بەندەکان نەبێت، لەوەیە بە دەستی خۆی، خۆی بخاتە دەستی دوژمنەوە، بەئەسیری بگیرێت و لە زیندانی دەروون و ئارەزووەکانیدا کۆت و زنجیری بکات، تووشی دڵتەنگی و خەم و خەفەت و حەسرەت ببێت، هۆکاری ئەمەیش نازانێت.

هەر بۆیە ڕەحمەتی پەروەردگاری میهرەبان پێی ئەوەی خواستووە کە لە پەرستشەکانی پەرستشێکی کۆکەرەوەی بۆ دابنێت کە بەش و دۆخەکانی جیاوازە، بەپێی جیاوازیی ئەو ڕووداوانەی لە بەندەکەوە دەر کەوتووە، بەپێی زۆر پێویستبوونی لە بەشی خۆی لە هەموو باشەیەک لە بەشەکانی ئەو بەندایەتییە.

## پاکیی پێیەکان

بەندە بەدەستنوێژ لە پیسییەکان پاک دەبێتەوە و بە پاکییەوە دەچێتە خزمەتی پەروەردگاری، دەستنوێژ ڕووکەش و ناوەڕۆکی هەیە، ڕووکەشەکەی پاکیی جەستە و ئەندامەکانی عیبادەتە، ناوەڕۆک و ڕازەکەی پاکبوونەوەی دڵە لە پیسییەکانی بە تەوبەکردن، هەر بۆیە خودا تەوبەکردن و پاکیی بەیەکەوە باس کردووە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلۡمُتَطَهِّرِينَ﴾[1]

واتە: خودا تەوبەکارانی خۆش دەوێت و پاکانی خۆش دەوێت.

ئەو کەسەیشی کە لە دەستنوێژ تەواو دەبێت، سوننەتە دوای وتنی شایەتومان، بڵێت: اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنَ التَّوَّابِينَ، واجْعَلْني مِنَ المُتَطَهِّرِينَ[2].

بەمەش ناخ و ڕووکەشی پاک دەبێتەوە.

بە شایەتومان لە شیرک پاک دەبێتەوە، بە تەوبەکردنیش لە تاوان پاک دەبێتەوە، بە ئاوی دەستنوێژیش لە پیسییەکانی جەستەی پاک دەبێتەوە، بەمەیش دەگاتە بەرزترین پلەی پاکبوونەوە پێش ئەوەی بچێتە خزمەتی خودا و لە بەردەمیدا بوەستێت، کە لە ڕووکەش و ناوەڕۆکدا پاک بوویەوە، مۆڵەتی دەدرێ لە بەردەم خودادا بوەستێت، چوونکە بە هاتنی بۆ ماڵەکەی و شوێنی پەرستشەکەی نەجاتی بووە لە ڕاکردن و هەڵهاتن.

هەر بۆیە هاتن بەرەو مزگەوت لە تەواویێتیی نوێژ بووە، کە لەلای هەندێک واجبە و لەلای هەندێکیش سوننەتە.

---

(١) سورة البقرة، الآية: ٢٢٢

(٢) الحديث عن عمر بن الخطاب، أخرجه الترمذي، كتاب الطهارة، باب فيما يقال بعد الوضوء: ١/٧٧

## ڕووکردنە قیبلە

بەندە لە کاتی بێئاگاییدا وەک ئەو کەسە وایە لەدەست گەورەکەی ڕای کردووە، دڵ و ئەندامەکانی وەستاون لەو خزمەتەی بۆی ئافرێندراوە، کە هاتەوە خزمەتی، ئەوا لە ڕاکردنەکەی گەڕاوەتەوە، ئەو دەمەی لە بەردەمیدا دەوەستێت، وەستانی بەندایەتی و ملکەچی و خۆشکاندنەوە، سۆزی گەورەکەی جووڵاندووە بەرامبەری و ڕووتێکردنی لەدوای دوورکەوتنەوە لێی.

فەرمانی پێ کراوە ڕوو بکاتە قیبلە، بە دڵیشی ڕوو بکاتە خودا، بۆ ئەوەی ڕزگاری ببێت لەو دوورکەوتنەوە و ئەو پشتتێکردنەی تییدا بوو، دواتر لە بەردەمیدا بوەستێت وەک کەسێکی ملکەچی زەلیلی داماو کە سۆزی گەورەکەی بەلای خۆیدا ڕادەکێشێت، بە موسڵمانی و تەسلیمبوونەوە چووەتە بەردەمی، سەری نەوی کردووە و دڵی ملکەچە، دڵی لە ئەو لا نادات و چاوی بە ڕاست و چەپدا ناگێڕێت، بەڵکوو بە دڵ و هەموو وجوودییەوە ڕووی تێ کردووە

## حەقیقەتی (الله أكبر)

دواتر بە ڕێز و شکۆوە بە گەورەی دادەنێت، لەمەیشدا دڵ و زوبانی هاوئاهەنگن، لە دڵیدا خودا لە هەموو شتێک گەورەتر بوو، ڕاستگۆییەکەی بەوە سەلماند کە لە دڵیدا هیچ شتێک لە خودا مەزنتر نەبووە هەتا پێوەی قاڵ ببێت، گەر قاڵ ببێت بە شتێکەوە جگە لە خودا و ئەوەی پێوەی قاڵە لە خودا گرنگتر بێت لەلای، ئەوا (اللەأکبر)ەکەی تەنها بە زوبان بووە و دڵی لەگەڵ نەبووە.

به وتنی (اللەأکبر):

١. لە پۆشاکی خۆبەگەورەزانین دەر دەچێت کە دژی بەندایەتییە.

٢. ڕێگریی لێ دەکات لەوەی دڵی بۆ غەیری خودا بچێت.

گەر خودا لەلای و لە دڵیدا لە هەموو شتێک گەورەتر بێت، ئەوا حەقی (اللەأکبر) و ئەنجامدانی عیبادەتی بەگەورەزانینی خودا لەو دوو نەخۆشییە دەیپارێزێت کە گەورەترین بەربەستە لەنێوان خۆی و خودادا.

## دوعای ئیستیفتاح

کە وتی: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ) و تاریفی خودای کرد بەو شێوەیەی کە شایستەیەتی، بەمەیش دەر دەچێت لەو بێئاگاییەی کە بەربەستە لەنێوان خۆی و خودادا.

ئەو سڵاو و ستاییشەی بەکار هێناوە کە بەرامبەر پاشاکان بەکار دێت لەو دەمەی دەچیتە لای، وەک بە گەورەدانان و ڕێزگرتن لێی و پێویستییەکەی بخاتە خزمەتی، ئەو تاریفکردنە لە دابونەریتی بەندایەتییە، کە وا دەکات ڕووی تێ بکات و لێی ڕازی بێت و پێویستییەکەی بەجێ بهێنێت.

## پەناگرتن بە خودا

پێش ئەوەی دەست بکات بە قورئانخوێندن، پەنا دەگرێت بە خودا لە شەیتانی دەرکراو لە ڕەحمی خودا، شەیتان لە هەموو کات زیاتر دژیەتی، چوونکە باشترین شوێنی بەندەیە و بەسوودترینە بۆ دونیا و قیامەتی، سوورە لەسەر ئەوەی ڕووی وەر بگێڕێت و دڵ و جەستەی لێ داببڕێت، گەر نەیتوانی بە جەستە دای ببڕێت، دڵی دادەبڕێت و ناهێڵێت لە بەردەم پەروەردگاریدا بوەستێت، هەر بۆیە فەرمان کراوە بە بەندە پەنا بگرێت بە خودا لێی بۆ ئەوەی بەسەلامەتی لە بەردەم خودادا بوەستێت، بۆ ئەوەی دڵی بژێنێتەوە و ڕووناکی بکاتەوە بەوەی لێی ڕادەمێنێت و لێی تێدەگات لە وتەی پەروەردگاری، کە هۆکاری ژیان و نیعمەتەکانی و ڕزگاربوونیەتی، شەیتان هەوڵ دەدات دڵی داببڕێت لە مەبەستی قورئانخوێندن.

کە خودا زانستی بەوە هەبوو دوژمنەکە جددیە و خۆی یەکلا کردۆتەوە بۆ بەندە، بێدەسەڵاتیی بەندەیشی زانی، هەر بۆیە فەرمانی پێ کرد پەنای پێ بگرێت و پەنای بۆ ببات بۆ ئەوەی لەکۆڵی بکاتەوە، ئەمەیش بەسە بۆ ڕووبەڕووبوونەوە و جەنگان لە دژی، وەک ئەوەی پێی وتراوە: تۆ توانای ئەم دوژمنەت نییە، پەنا بۆ من بێنە ڕزگارت دەکەم لە دەستی و ناهێڵم زیانت لێ بدات.

ڕۆژێکیان شەیخولئیسلام پێی وتم: (گەر سەگی مەڕەکان پێت وەڕی، خۆت قاڵ مەکە بە شەڕکردن لەگەڵی، پەنا ببە بۆ شوانەکە، ئەو دەتوانێت سەگەکەت لێ دوور بخاتەوە.)

کە پەنای گرت بە خودا لە شەیتان، لێی دوور دەخاتەوە، دڵ دەچێت بۆ لای واتاکانی قورئان، دەچێتە باخچەیەک کە مایەی دڵخۆشییە، سەرسووڕهێنەرەکانی دەبینێت کە ئاوەز شۆک دەکات، لە گەنجینەکانی

شتانێک دەر دەکات کە چاو نەیدیوە و گوێ بیسەری نەبووە، بەربەستی نێوان خۆی و هەموو ئەمانە نەفس و شەیتانە، نەفس کاردانەوەی هەیە بۆ شەیتان و گوێڕایەڵیەتی، ئەو دەمەی دوور دەکەوێتەوە لێی و دەڕوات، پاشا گرنگیی پێ دەدات و جێگیری دەکات و ئەوە دەهێنێتە یادی کە بەختەوەری و سەرکەوتنی تێدایە.

## قورئانخوێندن

که دەستی کرد به خوێندنی قورئان، چووەته پێگەی قسەکردن لەگەڵ پەروەردگاری و موناجاتکردنی، با تەواو ئاگادار بێت له تووڕەبوونی، بەوەی موناجاتی بکات و قسەی لەگەڵ بکات، بەڵام ڕووی له شتێکی تر بێت، ئەمە وا دەکات تووڕەیی خودا بەدەست بهێنێت، ئەمە وەک کابرایەک وایه پاشایەک له پاشاکانی دونیا له خۆی نزیک کردووەتەوە و هێناویەتیه بەردەمی خۆی، پاشاکه قسەی بۆ دەکات، ئەویش پشتی لێ کردووە و هەر ڕاست و چەپیەتی، گومانت چییه به تووڕەیی ئەو پاشایە، ئەی گومانت چییه به پاشای حەق که پەروەردگاری جیهانیانه و ڕاگری ئاسمانەکان و زەوییە؟!

با له هەموو ئایەتێکی فاتیحەدا بوەستێت و چاوەڕێی وەڵامی پەروەردگاری بکات، وەک ئەوەی گوێی لێیه که دەفەرمووێت: بەندەکەم سوپاسی کردم، لەو دەمەی وتی: ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، که وتی: ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ ساتێک بوەستێت و چاوەڕێی پەروەردگاری بکات که دەفەرمووێت: بەندەکەم تاریفی کردم، که وتی: ﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾، چاوەڕێی پەروەردگاری بکات که دەفەرمووێت: بەندەکەم ڕێزی لێ گرتم، که وتی: ﴿ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ﴾، چاوەڕێی پەروەردگاری بکات که دەفەرمووێت: ئەمە لەنێوان من و بەندەکەمدایە، که وتی: ﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴾، چاوەڕێی پەروەردگاری بکات که دەفەرمووێت: ئەمەیش بۆ بەندەکەمە، چ داوا بکات پێی دەبەخشم.[1]

---

(١) ئاماژەیه بۆ فەرموودەکەی ئەبوهورەیرە، که ئیمامی موسلیم گێڕاویەتیەوە.

## چێژی نوێژ

هەرکەسێک چێژی نوێژ بچەژێت، بۆی دەر دەکەوێت اللهأکبر و فاتیحە تەنها لە شوێنی خۆیاندا دەبن، وەک چۆن وەستان و ڕکوع و سوجدەیش تەنها لە شوێنی خۆیاندا دەبن، هەموو بەندایەتییەک لە بەندایەتییەکانی نوێژ نهێنی و کاریگەری و بەندایەتییەکی هەیە کە لە غەیری ئەودا بەدی نایەت، دواتر هەر ئایەتێک لە ئایەتەکانی سورەتی فاتیحە بەندایەتی و تاموچێژێکی تایبەت بە خۆی هەیە.

﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ﴾

که دەگەیتە: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، لەژێر ئەم وشەیەدا سەلماندنی هەموو کامڵبوونێک بۆ خودا دەبینیت لە کردەوە و پەسن و ناوە بەرزەکانی، پاکڕاگرتنی لە هەموو عەیب و خراپەیەک لە کردەوە و پەسن و ناودا، خودا سوپاسکراوە لە کردەوە و پەسن و ناوەکانیدا، پاک و بێگەردە لە هەموو عەیب و کەموکورتییەک لە کردەوە و پەسن و ناوەکانیدا، کردەوەکانی هەمووی حیکمەت و ڕەحمەت و بەرژەوەندی و دادپەروەرییە و لەمەیش دەر ناچێت، هەموو پەسنەکانی پەسنی کەماڵ و مەزنییە، هەموو ناوەکانی جوانە، سوپاسگوزارییەکەی دونیا و قیامەتی پڕ کردووە، ئاسمانەکان و زەویی پڕ کردووە لەگەڵ ئەوەی لەنێوانیاندایە و تیایاندایە، هەموو گەردوون سوپاسگوزاری ئەون، سوپاسگوزاری ئەو هۆکاری وجوودی هەموو مەوجوودێکە، ئامانجی هەموو مەوجوودێکیشە...

لە خودی خۆیدا سوپاسکراوە، گەرچی بەندەکانی سوپاسیشی نەکەن، وەک چۆن خودای تاک و تەنهایە، گەرچی بەندەکانی بە تاک و تەنهای دانەنێن، پەرستراوی حەقە گەرچی نەیپەرستن، سوپاسگوزاری خۆی بووە لەسەر زمانی ئەو کەسەی وتی: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، وەک چۆن پێغەمبەری خودا دەفەرموێت: (خودای گەورە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەیەوە فەرموویەتی: سمع الله لمن حمده.)[1]

لە حەقیقەتدا خودا سوپاسگوزاری خۆیەتی لەسەر زاری بەندەکەی، چوونکە ئەوە خودایە سوپاسگوزاریی خستووەتە سەر زوبان و دڵی بەندەکەی.

---

(١) ئاماژەیە بۆ فەرموودەکەی ئەبو موسای ئەشعەری، کە ئیمامی موسلیم گێڕاویەتیەوە بە ژمارە (٤٠٤).

هەموو سوپاسگوزاییەک بۆ ئەوە، هەموو موڵکێک بۆ ئەوە، هەموو چاکەیەک بەدەست ئەوە، هەموو کارەکان دەگەڕێنەوە بۆ لای ئەو، زانینی ئەمە لە بەندایەتی سوپاسگوزارییە.

هەر لە بەندایەتیکردنی ئەوەیە بزانێت کە سوپاسگوزاربوونی بۆ خودا نیعمەتێکە لە خوداوە، کە ئەمەیش شایانی سوپاسگوزارییە، کە سوپاسی کرد لەسەر ئەم نیعمەتە، پێویستە لەسەری لەسەر نیعمەتی سوپاسگوزاربوونی جارێکی تر سوپاسی خودا بکات...

گەر بەندە هەموو هەناسەکانی لە سوپاسگوزاریی خودادا سەرف بکات لەسەر نیعمەتێک لە نیعمەتەکان کە پێویستە سوپاسی خودا بکرێت لەسەری، شایانی ئەوەیە و زۆر زیاتریش، هیچ کەسێک ناتوانێت بەتەواوی ستاییشی خودا بکات لەسەر ئەو شتانەی شایانی سوپاس و ستاییشە.

لە بەندایەتیی بەندە ئەوەیە گەواهی بدات کە دەستەوسانە لە سوپاسگوزاریی خودا بەو شێوەیەی کە شایستەیەتی، خودا سوپاسکراوە لەسەر ئەمە، چوونکە ئەوە خودایە خستوویەتیە سەر دڵ و زاری.

لە پەرستشی سوپاسگوزاری ئەوەیە خودا سوپاسگوزاریی زاڵ کردووە بەسەر هەموو دۆخەکانی بەندەدا بە دیار و نادیاریەوە، لەوەی بەندە خۆشی دەوێت یان ڕقی لێیەتی، لە حەقیقەتدا خودا لەسەر هەموو ئەوانە سوپاسکراوە، گەرچی لەلای بەندەیش نادیار بێت...

﴿ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾

پاشان دەگەیت بە ﴿رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، شایەدی ئەوە دەدەیت کە خودا تاکە پەروەردگارە، وەک چۆن پەروەردگاری جیهانیانە، ئافرێنەر و ڕۆزیدەر و بەڕێوەبەری کاروباریانە، هەر ئەو ئەوانی هێناوەتە بوون و هەر ئەویش لەناویان دەبات، تەنها ئەو خودا و پەرستراویانە، پەناگەیانە لە کاتی نارەحەتیدا، هیچ پەروەردگارێک نییە جگە لە ئەو، هیچ خودایەک نییە جگە لە ئەو.

﴿ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾

پاشان دەگات بە ﴿ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، بەندایەتییەکی تایبەت بە خۆی هەیە، ئەویش گەواهیدانە بەوەی کە ڕەحمەتەکەی هەموو شتێکی گرتووەتەوە، هەموو بوونەوەرێکیش بەشی خۆی وەر گرتووە لەو ڕەحمەتە، بەتایبەت ئەو ڕەحمەتە تایبەتەی کە بەندەکەی ڕاوەستاوە لە خزمەتیدا و موناجاتی دەکات بە وتەی خۆی و داوای ڕەحمەت و هیدایەتی لێ دەکات، داوای تەواوێتیی نیعمەتەکانی لێ دەکات، ئەمەیش لە ڕەحمەتیەتی بە بەندەکەی، ڕەحمەتەکەی هەموو شتێکی گرتووەتەوە، وەک چۆن سوپاسگوزارییەکەی هەموو شتێکی گرتووەتەوە.

(مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ)

پاشان دەڵێت بە (مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ)، لە ناوەرۆکەکەی رادەمێنێت بۆ ئەوەی رۆژی پەسلان بچەسپێنێت، خوا لەو رۆژەدا بڕیار دەدات لەنێوان ئافریدراوەکانیدا، رۆژێکە تێیدا بەندەکان پاداشتی کردەوەکانیان وەر دەگرن بە چاک و خراپەوە، ئەمەش لە وردەکاری و پێویستی سوپاسگوزاریی خوایە.

که (ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ) سوپاسکردنی خوا بوو، خوایش فەرمووی: بەندەکەم سوپاسی کردم، که (ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ) دووبارەکردنەوەی سیفاتی کەمالی خوا بوو، خوایش فەرمووی: (بەندەکەم ستایشی کردم)، ستایشکردنیش دووپاتکردنەوەی باشی و ژمارەنی پەسنەکانی ستایشکراوەکەیە، که پەسنی خوای کرد بە تاکە پاشای رۆژی دوایی (مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ)، پاشای حەقە که دادپەروەری و گەورەیی و مەزنی و تاک و تەنهایی خوا و بەراستخستنەوەی پێغەمبەرەکەی بەدی دەخات، خوا ئەم ستایشکردنەی ناو ناوە ڕێزلێگرتن، دەفەرموێت: (بەندەکەم ڕێزی لێ گرتم)، ڕێزلێگرتنیش ستایشکردنە بە سیفاتی مەزنی و شکۆ.

﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾

کە وتی: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾، چاوەڕێی وەڵامی پەروەردگاری دەکات کە دەفەرموویت: ئەمە لەنێوان من و بەندەکەمدایە، بۆ بەندەکەم هەیە چ داوا بکات. ڕادەمێنێت لە بەندایەتیی ئەو دوو وشەیە و مافەکانی، ئەو وشەیە جیا دەکاتەوە بۆ خودایە و ئەو وشەیەی بۆ بەندەیە، هەروەها لە نهێنی و ڕازی ئەمەیش تێگەیشت، جیاوازیی کرد لەنێوان ئەو تەوحیدەی وشەی ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ پێویستی دەکات، لەگەڵ ئەو تەوحیدەی وشەی ﴿وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ پێویستی دەکات، لە نهێنیی ئەوە تێگەیشت بۆچی لە ناوەڕاستی سورەتەکەدایە، کە لە پێشدا سوپاس و ستاییشی خودا هاتووە و لە دواییشدا دوعا هاتووە، تێگەیشت بۆچی ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ پێش ﴿وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ خراوە، بۆچی مەفعولەکە پێش فیعلەکە کەوتووە، لە نهێنیی دووبارەبوونەوەی ضەمیرەکە گەیشت، زانیی ئەو دوو وشەیە چەندێ دەرد و نەخۆشی دوور دەخەنەوە، کە هەڵوەشێنەرەوەی بەندایەتین، زانیی ئەو دوو وشەیە چۆن دەیخەنە ژێر سایەی بەندایەتییەوە، بەڵکوو چۆن ئافراندن و فەرمانەکان و پاداشت و سزا، دونیا و قیامەتی لەسەر دەسووڕێتەوە، چۆن بەرزترین ئامانج و تەواوترین ئامرازی لەخۆ گرتووە و چۆن بە ضەمیری خیطاب و ئامادە باس کراوە، بەبێ ضەمیری غائیب.

﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴾

دواتر ڕاما لە پێویستی و ئاتاجبوونی بۆ ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾،

**کە ناوەڕۆکەکەی ئەمەی لەخۆ گرتووە:**

١. ناسینی حەق.

٢. ویستنی و شوێنکەوتنی.

٣. کارپێکردنی.

٤. جێگیربوون لەسەری.

٥. بانگەوازبۆکردنی و ئارامگرتن لەسەری.

بە کامڵبوونی ئەم پێنج پلەیە، هیدایەتەکەی کامڵ دەبێت، لە هەردانەیەکیشی کەم بێت لە هیدایەتەکەی کەم دەبێتەوە.

## کاروبارەکانی هیدایەت

بەندە لە ناخ و ڕووکەشدا پێویستی بە هیدایەتە، لە هەموو ئەوەی دەیکات و وازی لێ دەهێنێت، پێویستی بە هیدایەتە.

### ئەو کاروبارانەی بەندە پێویستی بە هیدایەتە:

**١.** کارێک بەبێ هیدایەت ئەنجامی داوە بە زانست و کردەوە و ویستەوە.

پێویستە لەسەری تەوبە بکات، تەوبەکردنەکەیشی هیدایەتە.

**٢.** کارێک کە هیدایەت دراوە بۆ بنەڕەتەکەی بەبێ وردەکارییەکانی، پێویستی بەوەیە هیدایەت بدرێت بۆ وردەکارییەکانی.

**٣.** کارێک کە لە ڕوویەکەوە هیدایەت دراوە و لە ڕوویەکی تریەوە هیدایەت نەدراوە، لەمەدا پێویستی بەوەیە بەتەواوی هیدایەت وەر بگرێت، بۆ ئەوەی هیدایەتەکەی کامڵ و تەواو بێت.

**٤.** کارێک کە پێویستی بەوەیە لە داهاتوویدا هیدایەت وەر بگرێت، وەک چۆن لە ڕابردوودا هیدایەتی وەر گرتبوو.

**٥.** کارێک بیروباوەڕی پێچەوانەی ئەوەیە کە لەسەریەتی، لەمەدا پێویستی بە هیدایەتێکە بیروباوەڕەکەی دڵی بسڕێتەوە و دژی ئەوە جێگیر بکات.

**٦.** کارێک کە دەتوانێت بیکات، بەڵام ئیرادەی کردنی نییە، لەمەیشدا پێویستی بە هیدایەتە بۆ ئەوەی ئیرادەی ئەنجامدانی هەبێت.

**٧.** کارێک کە دەیەوێت بیکات، بەڵام توانای ئەنجامدانەکەی نییە، لەمەیشدا پێویستی بە هیدایەتە بۆ ئەوەی توانای ئەنجامدانی هەبێت.

٨. کارێک کە نە توانای هەیە بۆ ئەنجامدانی، نە ئیرادەی هەیە، لەمەیشدا پێویستی بە توانا و ئیرادە هەیە بۆ ئەوەی بەتەواوی هیدایەت وەر بگرێت.

٩. کارێک کە لەسەر هیدایەتە، لە زانست و کردەوە و ئیرادەدا، لەمەیشدا پێویستی بە جێگیربوون و بەردەوامبوونە لەسەری.

هەر بۆیە داواکردنی هیدایەت گەورەترین پێویستیی بەندەیە، لە هەموو شتێک زیاتر ئاتاجی ئەو هیدایەتەیە، لەبەر ئەمە پەروەردگاری بەبەزەیی لەسەری پێویست کردووە ڕۆژانە داوای هیدایەتی لێ بکات لە باشترین دۆخیدا، کە ئەویش پێنج فەرزەکەیە، بە هۆی زۆر پێویستبوون و ئاتاجبوونی بەو شتەی داوای دەکات.

## خەڵکی و هیدایەت

دواتر خودا ڕوونی کردەوە کە ئەهلی ئەم هیدایەتە جودان لە ئەهلی غەزەب و ئەهلی گومڕایی، کەواتە بە نیسبەت ئەم هیدایەتەوە خەڵکی بوون بە سێ بەشەوە:

**١.** لەو نیعمەتە بەهرەمەند بووە و پێی بەخشراوە، بەردەوامبوونی بەشەکەی لەم نیعمەتە بەپێی بەشەکەیەتی لە وردەکاری و بەشەکانی.

**٢.** گومڕایە و لەم هیدایەتەی پێ نەبەخشراوە و مۆفەق نەبووە بۆی.

**٣.** خەشم و قینی لێ گیراوە، چوونکە زانیویەتی و کاری پێ نەکردووە.

یەکەم بەهرەمەند بووە لەو هیدایەتە و بە علیم و عەمەلەوە شوێنی کەوتووە.

دووەم گومڕایە، نە زانستی پێی هەیە، نە کاری پێ کردووە.

سێیەم خەشم و قینی لێ گیراوە، زانستی پێی هەبووە، بەڵام ڕامالراوە لە کارپێکردنی.

## ڕەوایەتیی ( آمین ) کردن

لەدوای تەواوبوونی لە سوورەتی فاتیحە، دەڵێت (آمین)، وەک گەشبینییەک بە وەڵامدانەوە و بەدەستهێنانی ئەوەی داوای کردووە، هەر بۆیە جووەکان ئیرەییان بە موسڵمانەکان برد لەو دەمەی لە نوێژی موسڵمانەکاندا بیسەری وشەی (آمین) بوون.

## ڕکـوع

دواتر پێش چوونە ڕکوع بۆی دانراوە هەردوو دەستی بەرز بکاتەوە، وەک بە گەورەدانانی فەرمانی خودا و جوانییەکی نوێژ و بەندایەتییەکی تایبەت بە دەستەکان وەک پەرستشی ئەندامەکانی تر، وەک شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەری خودا ﷺ کە ڕازێنەرەوە و جوانکاری نوێژە، وەک بەگەورەدانانی دروشمەکانی.

پاشان دەڵێت (اللهأکبر)، کە لە ڕوکنێکەوە بۆ ڕوکنێکی تر دەیڵێت، وەک تەلبیەی حاجییان وایە لە عیبادەتێکەوە بۆ عیبادەتێکی تر، دروشمی نوێژە، وەک چۆن تەلبیە دروشمی حەجە، بۆ ئەوەی بەندە بزانێت نهێنی و ڕازی نوێژ بە گەورەدانانی خودایە و بەتەنها پەرستشکردنیەتی!

دواتر بەملکەچییەوە دەچێتە ڕکوع، ملکەچییەک بۆ مەزنییەکەی، ملدانێک بۆ هەیبەتەکەی، زەلیلبوونێک بۆ عیززەتەکەی، بەندە پشتی بۆ چەماندەوە، سەری بۆ نەوی کرد، پشتی بۆ نوشتاندەوە وەک بەگەورەزانینێک بۆی، بە زمانیش پاک ڕای گرت لە هەموو کەموکورتییەک هاوتا لەگەڵ بەگەورەزانینی، کەچبوونی دڵ و ئەندامەکان و وتەی بۆ کۆ کردەوە لە باشترین دۆخیدا، لە زیکرەکەیشیدا ملکەچی و بە مەزندانانی پەروەردگاری و پاکڕاگرتنی لە هەموو کەموکورتییەکی کۆ کردەوە.

ملکەچبوون پەسنی بەندەیە، گەورەیی و مەزنییش پەسنی پەروەردگارە.

لە تەواوێتیی ڕکوع ئەوەیە بەندە خۆی بچووک بکاتەوە و بێتەوە یەک، بە جۆرێک ئەمە هەموو خۆبەگەورەزانینەکانی دەروونی بسڕێتەوە، لە جێگەیدا مەزنیی پەروەردگاری بچەسپێنێت، هەتا زیاتر مەزنیی پەروەردگاری لە دڵیدا بێت، لەلای خۆی زیاتر بچووک دەبێتەوە، لە ڕکوعدا خودی دڵ مەبەستە، ئەندامەکانیش شوێنکەوتە و تەواوکارن.

## هەستانەوە لە ڕکوع

لەدوای هەستانەوەی لە ڕکوع و وەستانی و گەڕانەوەی بۆ جوانترین شێوازی، سوپاس و ستاییشی پەروەردگاری دەکات، چوونکە خودا مۆفەقی کردووە بۆ ئەو ملکەچییە، دواتر لەوەوە گواستیەوە بۆ ڕێکوەستان لە بەردەمیدا، لە خزمەتیدا وەستا وەک چۆن پێشتر لە کاتی قورئانخوێندندا وەستابوو.

ئەم وەستانە چێژ و دۆخێکی تایبەتی هەیە کە دڵ هەستی پێ دەکات، کە جودایە لە چێژ و دۆخی ڕکوع، ئەم ڕوکنە خودی خۆی داواکراوە وەک ڕوکنی ڕکوع و سوجدە، هەر بۆیە پێغەمبەری خوداﷺ وەک کڕنووش و سوجدە تێیدا دەمایەوە و درێژی دەکردەوە، تێیدا زۆر سوپاس و ستاییشی خودای دەکرد، وەک چۆن لە ڕێنوێنییەکانیدا باسمان کرد[١]، لە کاتی شەونوێژدا زۆر تێیدا دەیوت: (لربيَّ الحمدُ، لربيَّ الحمدُ) و دووبارەی دەکردەوە[٢].

---

(١) بڕوانە زاد المعاد: ١/٥٥

(٢) بەشێکە لەو فەرموودەیەی کە حوزەیفە گێڕاویەتیەوە، ئەبو داود و نەسائی و ئەحمەد گێڕاویانەتەوە.

## سوجدەی یەکەم

دواتر بۆی دانراوە (اللهأکبر) بکات و بچێتە سوجدە، لە سوجدەکەیدا هەموو ئەندامێک لە ئەندامەکانی بەشی خۆی پێ دەدات لە بەندایەتیکردن، لە بەردەم پەروەردگاریدا ناوچەوانی بخاتە سەر زەوی و لووتی بۆ شۆڕ بکات، دڵی بۆ کەچ بکات، بەڕێزترین شت تێیدا کە ڕوخساریەتی بیخاتە سەر زەوی، لووتی بۆ نەوی بکات و دڵ و ئەندامەکانی بۆ کەچ بکات، وەک زەلیلبوونێک بۆ مەزنییەکەی، ملکەچبوونێک بۆ عیززەتەکەی و ملدان لە بەردەمیدا، شتێکی زەلیل و شکاو کردووە بۆ پەروەردگاری، تەسبیحاتی دەکات بە باڵابوونەکەی لە مەزنترین نەویبوونیدا، بەرزییەکەی ئالاوە بە نەویبوونەکەی بە زەلیلبوون و ملکەچی و شکانەوە، دڵیشی هاوتایە لەگەڵ حاڵی جەستەیدا، دڵیش وەک ڕوخساری سوجدەی بردووە، لووت و هەردوو دەست و ئەژنۆ و پێیەکانی لەگەڵیدا سوجدەیان بردووە.

بۆی دانراوە ڕانی جیا بکاتەوە لە قاچی، سکی جیا بکاتەوە لە ڕانی، دەستەکانی جیا بکاتەوە لە لاکانی، بۆ ئەوەی هەموو ئەندامەکانی بەشی خۆی ببات لە بەندایەتیکردن و هەندێکیان هەندێکی تریان هەڵنەگرن.

لەم حاڵەدا لە هەموو کاتێک شایستەترە کە لە حاڵەکانی تر زیاتر لە خوداوە نزیک بێت، وەک چۆن پێغەمبەری خودا دەفەرمووێت:

(نزیکترین کات کە بەندە لە خوداوە نزیکە، ئەو کاتەیە کە لە سوجدەدایە.)[1]

---

(١) رواه مسلم

## سوجدەی دڵ

که سوجدەی دڵ ملکەچییەکی تەواوی تێدایە بۆ پەروەردگاری، خودایش بەردەوامیی داوە بەم سوجدەیە هەتا ڕۆژی دوایی.

وەک چۆن لە هەندێک لە سەلەفییان پرسیووە: ئەری دڵ سوجدە دەبات؟

ئەوانیش وتیان: (ئەرێ بە خوا، سوجدەیەک کە سەر بەرز ناکاتەوە هەتا دەگات بە خودا.)

## ناوەکانی نوێژ

نوێژ لەسەر پێنج شت بونیاد نراوە: قورئانخوێندن، بەپێوەوەستان، ڕکوع، سوجدە، زیکر. بە هەریەکێک لەم پێنج ناوە ناو نراوە.

پێی وتراوە (قیام)، وەک چۆن خودا دەفەرمووێت:

﴿ قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴾(١)، واتە: شەو هەستە نوێژ بکە، مەگەر کەمێکی نەبێت.

﴿ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ﴾(٢)، واتە: لە نوێژدا بوەستن بۆ خوا بەگەردنکەچی.

پێی وتراوە (قیرائە)، وەک چۆن خودا دەفەرمووێت:

﴿ وَقُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِۖ إِنَّ قُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِ كَانَ مَشۡهُودٗا ﴾(٣)

واتە: هەروەها نوێژی بەیانی بەجێ بێنە، قورئانخوێندنی نوێژی بەیانی هەمیشە دەبینرێت (لەلایەن فریشتەکانی شەو و ڕۆژ)ەوە.

پێی وتراوە (ڕکوع)، وەک چۆن خودا دەفەرمووێت: ﴿ وَٱرۡكَعُواْ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴾(٤)

واتە: لەگەڵ کڕنووشبەراندا کڕنووش بەرن.

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱرۡكَعُواْ لَا يَرۡكَعُونَ ﴾(٥)

---

(١) سورة المزمل، الآية: ٢

(٢) سورة البقرة، الآية: ٢٣٨

(٣) سورة الاسراء، الآية: ٧٨

(٤) سورة البقرة، الآية: ٤٣

(٥) سورة المرسلات، الآية: ٤٨

واتە: کاتێک پێیان بوترێ لە خوا بترسن و کڕنووش بەرن، کڕنووش نابەن.

پێی وتراوە (زیکر)، وەک چۆن خودا دەفەرموویت:

﴿ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ ﴾[1]، واتە: کاتێک کە بانگ درا بۆ نوێژ لە ڕۆژی هەینیدا، بەپەلە بڕۆن بۆ یادی خودا...
﴿ لَا تُلۡهِكُمۡ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَـٰدُكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ ﴾[2]

واتە: ماڵ و منداڵەکانتان بێئاگاتان نەکەن لە یادی خوا.

بەڕێزترین کاری نوێژ سوجدەیە، بەڕێزترین زیکریشی قورئانخوێندنە، یەکەمین سورەت کە دابەزییە سەر پێغەمبەری خودا ﷺ سەرەتاکەی خوێندنەوە بوو، کۆتاییەکەیشی سوجدە بوو، ڕکاتی نوێژیش ئاوا دانراوە، یەکەمەکەی قورئانخوێندنە و کۆتاییەکەی سوجدەبردنە.

---

(١) سورة الجمعة، الآية: ٩

(٢) سورة المنافقون، الآية: ٩

## هەستانەوە لە سوجدە

دواتر سەری بەرز دەکاتەوە و دادەنیشێت، چوونکە ئەم دانیشتە دەور دراوە بە دوو سوجدە، سوجدەیەک لە پێش و سوجدەیەک بەدوایدا، هەر بۆیە پێگەیەکی تایبەتی هەیە، پێغەمبەری خوداﷺ بە ئەندازەی سوجدە درێژی دەکردەوە و دەگەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری، داوای لێخۆشبوونی لێ دەکرد و داوای ڕەحمەت و هیدایەت و ڕۆزی و ئارامیی لێ دەکرد[1]، ئەم دانیشتنە چێژ و دۆخێکی تایبەت بە دڵ دەبەخشێت کە جودایە لە چێژ و دۆخی سوجدە.

---

(١) فەرموودەکە صەحیحە و ئەبو داود گێڕاویەتیەوە.
دوعاکە بەم شێوەیەیە: (اللَّهمَّ اغفِر لي وارْحَمني واجبُرني واهدِني وارزُقني).

## دانیشتنی نێوان سوجدەکان و چێژەکەی

بەندە لەم دانیشتنەدا دەستەوئەژنۆ لە بەردەم پەروەردگاریدا کەوتووە، داوای لێبوردن دەکات لەو تاوانەی ئەنجامی داوە، بە هیوای ئەوەی خودا لێی خۆش بێت و ڕەحمی پێ بکات و یارمەتیی بدات لەسەر ئەو نەفسەی کە فەرماندەرە بە خراپە.

پێغەمبەری خودا ﷺ لەم دانیشتنەدا زۆر داوای لێخۆشبوونی لە خودا دەکرد[١] و زۆر دەگەڕایەوە بۆ لای.

نەفست بخە شوێنی کەسێک کە قەرزارە و حەقی خودای لەلایە و تۆیش کەفیلی ئەویت، قەرزارەکەیش قەرزەکە دوا دەخات و فێڵبازە، تۆ کەفیلیت و قەرزارەکەیش دەبێت حەقەکە بگەڕێنێتەوە.

تۆیش یارمەتیی دەدەیت هەتا ئەو حەقەی لەلایە بیداتەوە و تۆیش لە کەفیلییەکە ڕزگارت بێت.

دڵیش هاوبەشی نەفسە لە خێر و شەڕدا، لە پاداشت و سزادا، لە ستاییش و سەرکۆنەکردندا، نەفس کاری ڕاکردن و دەرچوونە لە کۆتی بەندایەتی و بەزایەدانی مافەکانی خودا، دڵیش هاوبەش و ئەسیریەتی گەر دەسەڵاتی بەهێز بێت، ئەویش هاوبەش و ئەسیریەتی گەر دەسەڵاتی بەهێز بێت.

---

(١) فەرموودەکە صەحیحە و ئیبنو ماجە گێڕاویەتیەوە.
دوعاکە بەم شێوەیەیە: (رَبِّ اغفِرْ لي، رَبِّ اغفِرْ لي).

## کۆکەرەوەی هەموو باشییەکان

بەندە کە سەری بەرز کردەوە لە سوجدە، دەستەوئەژنۆ لە بەردەم خودادا دەوەستێت، داوای لێبوردن لە خودا دەکات لەوەی تێیدا بووە، بە هیوای ئەوەی خودا ڕەحمی پێ بکات و لێی خۆش ببێت و هیدایەتی بدات و ڕۆزیی بدات و ئارامیی پێ ببەخشێت[1]، ئەم پێنجە خێری دونیا و قیامەتی لەخۆ گرتووە.

بەندە پێویستیەتی، بەڵکوو ناچارە بۆ ئەوەی بەرژەوەندییەکانی لە دونیا و قیامەتدا بەدەست بهێنێت، هەروەها دوورخستنەوەی ئەو شتانەی لە دونیا و قیامەتدا زیانی لێ دەدات، ئەم دوعایەش گەرەنتیی ئەوانەی بۆ دەکات. ڕۆزی بەرژەوەندییەکانی دونیای بۆ ڕادەکێشێت و سەلامەتییش زیانەکانی لێ دوور دەخاتەوە، هیدایەتیش بەرژەوەندیی قیامەتی تووش دەکات و لێخۆشبوونیش زیانەکانی لێ دوور دەخاتەوە، ڕەحمەتیش هەموو ئەوانە جەم دەکات.

---

(١) دوعاکە بەم جۆرەیە: اللَّهمَّ اغفِرلي وارْحَمني واجبُرْني واهدِني وارزُقْني. (وەرگێڕ)

## سوجدەی دووەم

دووبارە وەک جاری پێشوو دەچێتەوە سوجدە، تەنها یەک سوجدە نابات وەک چۆن یەک ڕکوعی برد، بە هۆی فەزڵ و ڕێز و پێگەی سوجدە لەلای خودا، بەندە لە کاتی سوجدەدا لە هەموو کات زیاتر لە خوداوە نزیکترە، لە هەموو کات زیاتر چۆتە ناو بەندایەتییەوە، هەر بۆیە کراوە بە کۆتایی ڕکاتێک و ئەوەی پێش ئەو وەک پێشەکییەک وایە بۆی، پێگەی لە نوێژدا وەک پێگەی تەوافکردنە لە حەجدا، وەک چۆن لە سوجدەدا لە هەموو کات زیاتر لە خوداوە نزیکە، لە مەناسیکەکانیشدا لە کاتی تەوافدا لە هەموو کات زیاتر لێوەی نزیکە.

هەر بۆیە هەندێک لە هاوەڵان بەوانەیان وت کە لە کاتی تەوافدا قسەی دونیاییان دەکرد: ئەوە باسی شتی وا دەکەیت؟ لە دەمێکدا لە کاتی سووڕانەوەمان بەدەوری کەعبەدا خۆمان پێشانی خودا دەدەین[1].

هەر بۆیە -خودایش زاناترە- ڕکوع پێش سوجدە خراوە، وەک پلەبەندییەک و ڕۆیشتن بۆ شتێک کە لەو باڵاترە.

## دانیشتنی تەحیات

لەو دەمەی نوێژەکەی تەواو کرد و تەنها ئەوە مایەوە سەلام بداتەوە، دانراوە لە بەردەم خودادا دانیشێت و ستاییشی بکات بە باشترین سڵاو و ڕێز، کە تەنها بۆ ئەو شیاوە و شایانی کەسی تر نییە.

---

(١) خاوەنی وتە ئیبنو عومەرە، الطبقات الكبرى لابن سعد: ٤/١٦٧

نەریتی پاشاکان وایە کە بە چەندین شێواز سڵاویان لێ بکرێت بە کردەوە و وتە، کە ملکەچی و ستاییشکردن و دوعای مانەوە و بەردەوامبوونی پاشایەتییەکەی لەخۆ بگرێت، هەیە بە سوجدەبردن سڵاوی لێ دەکات، هەیە بە ستاییشکردن سڵاوی لێ دەکات، هەیە بە دوعای تەمەن درێژی و مانەوە سڵاوی لێ دەکات، هەیە هەموو ئەوانە لە سڵاوەکەیدا کۆ دەکاتەوە، پاشای حەق خودای گەورە لەپێشترە بە هەموو ئەو سڵاوانە لەلایەن ئافرێنراوەکانیەوە، لە حەقیقەتدا تەنها بۆ ئەوە، هەر بۆیە وتراوە مەبەست لە التَّحيَّات: مانەوەی موڵک و دەسەڵاتە، وتراوە مانەوە و بەردەوامییە کە خودا شایەسترە بەمە.

هەر سڵاوێک کە لە پاشاکان دەکرێت لە سوجدەبردن و ستاییش و مانەوە و بەردەوامی، هەموو ئەوانە بۆ خودایە، هەر بۆیە ئەلیف و لامی پێوەیە و هەموو سڵاوێک دەگرێتەوە...

بە پاشاکانیان دەوت: ژیانێکی بەردەوامت هەبێت، هەندێکیان دەیانوت: دە هەزار ساڵ بژیت، خودا بەردەوامی بدات بە ڕۆژەکانت، خودا مانەوەت درێژە پێ بدات، هاوشێوەی ئەمانە کە مەبەست لێی بەردەوامیی ژیان و دەسەڵات و موڵکە، مانەوەی دەسەڵات و ژیانیش تەنها بۆ ئەو زاتەیە کە هەمیشە دەژی و مردنی بەسەردا نایەت، شایانی ئەو پاشایەیە کە هەموو موڵکەکان لەناو دەچن غەیری موڵک و دەسەڵاتی ئەو نەبێت.

## و الصَّلـواتُ

دواتر بە واوی عەتف وشەی (الصَّلوات)یشی عەتف کردە سەری، بە لەفزی جەمع و مەعریفە بۆ ئەوەی هەموو ئەو شتانە بگرێتەوە کە وشەی (الصلاة)ی بۆ بەکار دێت بە گشتی و تایبەتەوە، هەموو ئەوانە بۆ خودایە و تەنها شایستەیە بە ئەو، موڵک و گەورەیی هەر بۆ خودایە، پەرستش هەر شایستەی ئەوە، موڵک و گەورەیی تەنها بۆ ئەوە، پەرستش و ڕەحمەت تەنها شایانی ئەوە.

## والطَّيِّباتُ

دواتر بە واوی عەتف (الطَّيِّبات)یشی عەتف کردە سەری، ئەمەیش دوو شت لەخۆی دەگرێت: پەسن و موڵک.

بە نیسبەت پەسنەکەوە خودا پاکە، قسەکانیشی پاکە، هەموو کردەوەکانی پاکە، تەنها پاکیی لێ وەدەر دەکەوێت، تەنها پاکییش دەدرێتە پاڵی، تەنها پاکیش بەرز دەبێتەوە بۆ لای، هەموو پاکی و چاکییەک هەر بۆ خودایە بە پەسن و کردەوە و قسە و دانەپاڵەوە، هەموو پاکێک دەدرێتە پاڵی، هەرچییەک درایە پاڵی پاکە، گوفتار و ڕەفتاری پاک هەر بۆ ئەوە، هەرچیی دراوەتە پاڵی پاکە وەک ماڵەکەی، بەندەکەی، ڕوحەکەی، حوشترەکەی، بەهەشتەکەی.

هەروەها واتە هەرچیی وشەی پاکە تەنها بۆ خودایە. وشە پاکەکان بەپاکڕاگرتنی و سوپاسکردنی و بەگەورەدانانی و ڕێزلێگرتنی و ستاییشکردنی دەگرێتەوە، ئەم وشە پاک و باشانە کە ستاییشی خودای پێ دەکرێت لەگەڵ واتاکانیدا تەنها بۆ خودایە و کەس هاوبەشی نییە تێیدا، وەک:

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ. تَبَارَكَ اسْمُكَ وَتَعَالَى جَدُّكَ. وَلاَ إِلهَ غَيْرُكَ.

سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ.

سُبْحانَ اللَّهِ العَظِيمِ، سُبْحانَ اللَّهِ وبِحَمْدِهِ.

هەموو پاک و چاکێک بۆ ئەوە و لەلای ئەوە، پاکە و تەنها پاک وەر دەگرێت، پەروەردگاری پاکەکانە، لە بەهەشتەکەیدا دراوسێکانی کەسە پاکەکانن.

ڕامێنە لە پاکترین وشەکان لەدوای قورئان کە تەنها شایستەی خودایە، کە ئەوانیش بریتین لە:

(سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ، ولا حولَ ولا قوَّةَ إلَّا باللَّهِ)

وشەی (سُبْحَانَ الله) هەموو پاکڕاگرتنێکی خودا لەخۆی دەگرێت لە کەموکورتی و عەیب و خراپە، پاکڕاگرتنی لە تایبەتمەندیی ئافرێنراوەکانی و چوواندن پێی.

وشەی (الْحَمْدُ لِلَّه) هەموو کامڵبوونێک لەخۆی دەگرێت بە قسە و کردەوە و پەسنەوە لەسەر باشترین و کامڵترین شێوەی لە ئەزەل و ئەبەدەوە.

وشەی (لَا إِلَهَ إِلَّا الله) بەتاکدانانی خودا لەخۆی دەگرێت، هەروەها هەموو پەرستراوێک جگە لە ئەو باتڵە و تەنها خۆی پەرستراوی حەقە و شایانی پەرستنە، هەرکەسێک جگە لە ئەو بکاتە پەرستراوی خۆی، وەک کەسێک وایە لە ماڵەکانی جاڵجاڵۆکەماڵێکی دروست کردبێت و پەنای بۆ ببات و نیشتەجێی بێت.

وشەی (اللهُ أَكْبَرُ) ئەوە لەخۆی دەگرێت کە خودا لە هەموو شتێک گەورەتر و مەزنتر و بەڕێزتر و بەهێزتر و بەتواناتر و زاناترە.

ئەم وشە پاک و باشانە، خودی وشەکە و واتاکانیشی تەنها بۆ خودایە و شایستەیە بەو زاتە.

## السَّلامُ على النَّبيُّ ﷺ و على عبادِ اللّٰهِ الصَّالحينَ

لەدوای ئەوەی سوپاس و ستاییشی خودای کرد، سڵاو لەو بەندانەی خودا دەکات کە هەڵی بژاردوون، ئەمەیش وەک ئەوەی جێبەجێکردنی ئەم ئایەتە بێت:

﴿ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓ ﴾[1]، واتە: بڵێ: سوپاس و ستاییش بۆ خودای میهرەبان، سڵاو لەسەر ئەو بەندانەش کە هەڵی بژاردووە.

هەروەها ئەم سڵاوکردنە لەدوای سڵاوکردنە لە ئافرێنەر، لە سڵاوەکەیشدا ئەو کەسە پێش خراوە کە لە هەمووان زیاتر شایستەیە، ئەویش پێغەمبەری خودایە ﷺ، کە ئوممەت لەسەر دەستی ئەو تووشی هەموو خێرێک بووە، دواتر سڵاو لە خۆی دەکات، لەگەڵ بەندە باشەکانی خودا کە تایبەترینیان پێغەمبەرانە، پاشان هاوەڵانی پێغەمبەری خودا ﷺ، ئەم سڵاوە هەموو بەندەیەکی باش دەگرێتەوە لە ئاسمان و زەویدا.

---

(١) سورة النمل، الآية: ٥٩

## شایەدیی حەق

لەدوای ئەوەی سڵاوی کرد لەوەی شاییستەی سڵاوە بە تایبەتی و گشتی، دانراوە بۆی شایەتیی حەق بدات کە نوێژ لەسەری بونیاد نراوە، ئەویش مافێکە لە مافەکانی، پێکەوە نەبێت سوودی پێ ناگەیەنێت، ئەویش شایەتیدانە بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ بە پێغەمبەرایەتی، بەوەیش نوێژەکە کۆتایی پێ دێت، وەک چۆن عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود دەفەرمووێت:

(گەر ئەوەت وت، نوێژەکەت تەواو کردووە و بەجێت هێناوە، گەر ویستت هەستیت، هەستە، گەر ویستت دانیشیت، دانیشە.)[١]

ئەمە یان مەبەستی تەواوبوونی نوێژەکەیە وەک کوفییەکان دەیڵێن، یان مەبەستی ئەوەیە نزیکە نوێژەکە کۆتایی بێت وەک ئەهلی حیجاز و غەیری ئەوان وتوویانە.

لەسەر هەردوو بۆچوونەکە، شایەتیدانی حەق کراوە بە کۆتایی نوێژ، وەک چۆن کراوە بە کۆتایی ژیانیش، هەرکەسێک کۆتا وشەی (لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ) بێت، دەچێتە بەهەشتەوە، وەک چۆن کەسێکیش کە دەستنوێژ دەگرێت، دانراوە بۆی دەستنوێژەکەی بە شایەتومان کۆتایی پێ بهێنێت.

---

(١) رواه أبوداود و كتاب الصلاة باب التشهد (١/٢٥٤).

## تەواوبوونی نوێـژ

کە نوێژەکەی تەواو بوو، ڕێی پێ دراوە داوای پێداویستییەکانی بکات، پێش ئەوە تەوەسول بکات بە سەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەری خودا ﷺ، چوونکە مەزنترین وەسیلەیە بۆ وەڵامدانەوەی دوعا، وەک چۆن لە فوزاڵەی کوڕی عەبیدەوە هاتووە کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: گەر یەکێکتان دوعای کرد، با سەرەتا سوپاس و ستاییشی خودا بکات، دواتر سەڵاوات بدات لەسەر پێغەمبەرەکەی ﷺ، ئینجا داوای پێویستییەکەی بکات[1].

تەحیاتیش وەک فەرموودەکە هاتووە، سەرەتاکەی سوپاس و ستاییشکردنی خودایە، دواتر سەڵاواتدانە لەسەر پێغەمبەرەکەی ﷺ، دواتر دوعاکردنە لە کۆتایی نوێژدا، لەدوای سەڵاواتدانەکە ئەو دوعایە دەکات کە پێی خۆشە بیکات، هاوشێوەی ئەمەیش دانراوە بۆ ئەو کەسەی کە گوێی لە بانگبێژە.

١. بانگبێژەکە چیی وت، ئەویش بیڵێتەوە.

٢. بڵێت: (رَضيتُ باللهِ ربًّا و بِالإسلامِ دِينًا و بِمُحمَّدٍ نَبيًّا).

٣. داوای پلەوپایەی وەسیلە و فەزیڵە بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ بکات.

٤. دواتر سەڵاوات بدات لەسەر پێغەمبەری خودا ﷺ.

٥. دواتر داوای پێویستییەکەی لە خودا بکات.

ئەمە پێنج سوننەتە لە وەڵامدانەوەی بانگبێژ کە پێویستە لێی بێئاگا نەبین.

(١) رواه الترمذي كتاب الدعوات، و قال الترمذي هذا حديث حسن صحيح.

## ڕووکردنە خودا

ڕاز و ڕوح و کرۆکی نوێژ ئەوەیە بەندە بە هەموو بوونیەوە ڕوو بکاتە خودا، وەک چۆن دروست نییە ڕووی لە قیبلە وەر بگێڕێت، بە هەمان شێوەیش نابێت دڵی لە خودا وەر چەرخێنێت بۆ شتێکی تر.

کەعبە، کە ماڵی خودایە، قیبلەی ڕوخسار و جەستەیەتی، پەروەردگاری کەعبەیش قیبلەی دڵ و ڕوحیەتی، لە نوێژەکەیدا چەندێک ڕووی لە خودا بێت، خوداش بەو ئەندازەیە ڕووی تێ دەکات، گەر پشتی تێ کرد، خودایش پشتی تێ دەکات.

### ڕووکردن لە نوێژدا سێ پێگەی هەیە:

١. ڕووکردنە دڵی، کە لە وەسوەسە و ئەو بیرکردنەوانە دەیپارێزێت کە پاداشتی نوێژەکەی بەتاڵ دەکاتەوە یان کەمی دەکاتەوە.

٢. ڕووکردنە خودا، ئەمەیش بەوە دەبێت هەست بە چاودێریی خودا بکات، بە جۆرێک هەست بکات کە دەیبینێت.

٣. ڕووکردنە واتای ئایەتەکانی و وردەکاریی پەرستشەکانی نوێژ بۆ ئەوەی حەقی خۆی پێ بدات.

بە تەواوکردنی ئەم سێ قۆناغە، بەجوانی نوێژەکەی ئەنجام داوە و بەرپای کردووە، خودایش بە ئەندازەی ئەوە ڕوو دەکاتە بەندەکەی.

کە بەندە لە بەردەمیدا وەستا، ئەوا ڕووی کردووەتە ڕاوەستاوی و مەزنییەکەی، کە (اللە أکبر)ی کرد، ئەوا ڕووی کردووەتە گەورەییەکەی.

که تەسبیحات و ستاییشی کرد، ئەوا رووی کردووەتە نوری رووی و پاکڕاگرتنی لەوەی شاییستەی ئەو نییە و ستاییشکردنی بە وەسفە جوانەکانی.

کە پەنای پێ گرت، ئەوا ڕووی کردووەتە گۆشە بەهێزەکەی و سەرخستنی بەندەکەی و پاراستنی لە دوژمنەکەی.

کە کەلامەکەی خوێندەوە، ئەوا ڕووی کردووەتە زانین و ناسینی کەلامەکەی، هەتا وەک ئەوەی دەیبینێت و لە وتەکانیدا بەدیی دەکات، وەک چۆن هەندێ لە سەلەف فەرموویانە: (خوداوەند لە وتەکانیدا خۆی بۆ بەندەکانی دەر خستووە.)[1] لەم دۆخەدا ڕوی کردووەتە زات و سیفات و کردەوە و بڕیار و ناوەکانی.

کە کڕنووشی برد، ئەوا ڕووی کردووەتە شکۆ و مەزنی و عیززەتەکەی، هەر بۆیە بۆی دانراوە بڵێت: (سبحان ربي العظيم).

کە سەری لە کڕنووش بەرز کردەوە، ڕووی کردووەتە سوپاس و ستاییشکردن و ڕێزلێنان و پەرستشکردن و بەتاکدانانی لە بەخشین و گرتنەوەدا.

کە سوجدەی برد، ڕووی کردووەتە نزیکبوون لێی و ملکەچبوون بۆی و خۆزەلیلکردن و شکان لە بەردەمیدا.

کە سەری بەرز کردەوە و دەستەوئەژنۆ وەستا، ڕووی کردووەتە دەوڵەمەندی و بەخششەکەی، ڕووی کردووەتە میهرەبانی و زۆر پێویستبوون پێی و ملکەچبوون و شکان لە بەردەمیدا، هەتا لێی خۆش

---

(١) خاوەنی وتەکە: جەعفەری کوڕی موحەممەد سادقە، بڕوانە (أحياء علوم الدين)، ٢٨٧/١.

بێت و ڕەحمی پێ بکات و سەلامەتی بکات و هیدایەت و ڕۆزیی بدات.

کە بۆ دانیشتنی تەحیات دانیشت، دۆخێک و ڕووکردنێکی تری هەیە، لە دۆخی ئەو حاجییە دەچێت کە تەوافی ماڵئاوایی دەکات، دڵی هەستی بەوە کردووە کە لە بەردەم پەروەردگاریدا دەڕوات، ئەو لەمپەر و مەشغەڵەتانە دەخاتە ڕوو کە ڕێگریی لێ دەکات لە بەردەمیدا بوەستێت، دڵی سزا و ئازاری ئەوەی چەشتووە، لە ماوەی نوێژەکەدا ڕوحی هەستی نزیکبوون لە خودا و ڕووکردنە ئەو و سەرەنجامەکەی چەشتووە، دواتر دڵی هەستی بەوە کردووە بە دەرچوونی لە نوێژەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی پێشوو، خەمی تەواوبوونی نوێژەکەی و فەراغەکەی هەڵگرتووە و دەڵێت خۆزگە بگەشتمایە بە ڕۆژی دوایی، دەزانێت لە موناجاتی زاتێک دەڕوات کە هەموو بەختەوەرییەک لە موناجاتی ئەودایە، بۆ موناجاتی کەسێک کە ئازار و خەم و خەفەت و نەگبەتی لە موناجاتکردنیدایە، هەست بە ئەمە و ئەوە ناکات، ئیللا ئەو دڵە نەبێت کە ئاوەدانە بە یادی خودا و خۆشویستن و شادومانبوون پێی.

## وێنەی نوێژ

کە دڵی ئارام بوو بە یاد و وتە و خۆشویستن و پەرستشکردنی، ئاسوودە و چاوگەش بوو پێی، بە ئیمانەکەی ئارامیی بەدەست هێنا، هەستانی بەم دوو کارە کارێکی پێویستە بۆی، بەبێ ئەوە نە ژیانی هەیە، نە دڵخۆشی و بەختەوەری.

ئەو شتانەی پێی تاقی کراوەتەوە لە نەفسی فەرماندەر بە خراپە و ئارەزووەکانی و شەیتانی فریودەر، دەبێتە هۆی لەدەستدانی یان کەمکردنەوەی بەشەکەی لەو شتە، ڕەحمەتی خودایش وەهای خواست کە نوێژی بۆ دابنێت وەک جێگرەوەیەک بۆ ئەوەی لەدەستی چووە، ئەوەی بۆ بگەڕێنێتەوە کە ڕۆیشتووە، نوێکەرەوە بێت بۆ ئەوەی لە ئیمانەکەی دروستی کردووە، وێنەی نوێژی لەسەر وێنەی کردەوەکانی داناوە بە خشوع و ملکەچییەوە، بە تەسلیمبوونەوە، هەموو ئەندامێک لە ئەندامەکانی بەشی خۆی لە بەندایەتی پێ داوە، بەرهەم و ڕوحەکەی لەوەدا داناوە کە بە هەموو بوونیەوە ڕوو بکاتە پەروەردگاری، پاداشتەکەیشی ئەوەیە لێی نزیک دەبێتەوە و لە دونیا و قیامەتدا ڕێز و میهرەبانییەکەی بەدەست دەهێنێت، پێگە و شوێنی نوێژی داناوە وەک چوونە خزمەت خودا و خۆڕازاندنەوە بۆ خۆپیشاندانی، وەک یادخستنەوەیەک بۆ خۆپیشاندانی گەورە لەو ڕۆژەی دەگات بە دیداری خودا.

## نوری دیده

وەک چۆن ڕۆژوو بەرهەمەکەی پاکبوونەوەی دەروونە، بەرهەمی زەکاتیش پاکبوونەوەی سەروەت و سامانە، بەرهەمی حەجیش بەدەستهێنانی لێخۆشبوونە، بەرهەمی جیهادیش تەسلیمکردنی نەفسە کە خودا لە بەندەکانی کڕیوە، بەهەشتی کردووە بە بەهاکەی، بەرهەمی نوێژیش ڕووکردنە خودایە، هەروەها ڕووکردنی خودایشە بۆ بەندەکەی، لەم ڕووکردنەدا بەرهەمی هەموو کردەوەکان هەیە، هەر بۆیە پێغەمبەری خودا ﷺ نەیفەرمووە نوری دیدەم کراوەتە ناو ڕۆژووەوە، یان حەج و عومرەوە، بەڵکوو فەرموویەتی: (نوری دیدەم خراوەتە ناو نوێژەوە)، نەیفەرموو خودی نوێژەکە، بەڵکوو چاوی گەش دەبێت بە چوونەناو نوێژەکە، وەک چۆن ئازیزێک چاوگەش دەبێت بە دەستلێدانی خۆشەویستەکەی، کەسێکی ترساو چاوگەش دەبێت بە گەیشتنەناو شوێنە ئارامەکەی، چاوگەشبوون بە چوونەناو شتێک کامڵتر و تەواوترە لەپێش ئەوەی بچێتە ناوی.

خۆشەویست ﷺ کە ویستی بچێت بۆ لای ئارامکەرەوەی دڵ لە ماندوویی و ناڕەحەتییەکان، فەرمووی: (ئەی بیلال، بە نوێژ ئاراممان بکەرەوە)، واتە بەرپای بکە بۆ ئەوەی بحەوێینەوە پێی لە ماندوویی ئەو شتانەی سەرقاڵی کردووین، وەک چۆن کەسێکی ماندوو ئیسراحەت دەکات، هەر هێندەی بگاتەماڵەوە و تێیدا دابنیشێت.

## ئاسوودەبوون بە نوێژ

بڕوانە چۆن فەرمووی بمانحەوێنەوە پێی، نەیفەرموو بحەوێینەوە لێی، وەک چۆن کەسێک وا دەڵێت کە نوێژەکە بە بار و قەرز بەسەریەوە دەزانێت، کە دڵی پڕ بووە لە غەیری ئەو و لەو شتانە دابڕاوە کە پێوەی قاڵە و خۆشەویستە لەلای، دەشزانێ دەبێت هەر نوێژەکەی بکات، بە زمانی حاڵ و قاڵی دەڵێت: نوێژەکەم دەکەم و ئیسراحەت دەکەم لێی، نەک ئیسراحەتی پێ دەکەم، ئەمە جۆرێکە و ئەوەیش جۆرێ تر، زۆر جیاوازن، ئەو کەسەی وەها تەماشای نوێژ دەکات کە کۆتە بۆ ئەندامەکانی و زیندانە بۆ دڵی، بەربەستە لە بەردەم دەروونیدا، لەگەڵ ئەو کەسەی نوێژ نیعمەتە بۆ دڵی و نوری دیدەیەتی و ئارامی و ئیسراحەتە بۆ ئەندامەکانی، بۆ دەروونیشی باخچە و چێژە.

**یەکەم:** نوێژ زیندانە بۆ نەفسی و کۆتە لەوەی بکەوێتە لەناوبەرەکانەوە، ئەمانە بە هۆی نوێژەکەیانەوە پاداشت وەر دەگرن و تاوانیان دەسڕێتەوە، بە ئەندازەی بەندایەتیکردنیان بۆ خودا لە نوێژەکەدا بەهرەمەند دەبن لە ڕەحمی خودا.

ئەمە بەندەیەکە و چووەتەماڵێک، بەڵام شتێک ڕێگرە لەنێوان ئەم و خاوەن ماڵدا، واتە لەودیو بەربەستێکەوەیە، هەر بۆیە چاوەکانی گەش نابێت، چوونکە لەناو بەربەستی ئارەزووەکانی و هەوری حەزەکانی و دووکەڵی دەروون و هەڵمی ئاواتەکانیدایە، دڵیش نەخۆشە و نەفسیش کەوتووە بەسەر ئەو شتانەی حەزی لێیەتی و داوای حەزە بەپەلەکەی دەکات.

* بەشەکەی تر کە نوێژ باخچەی دڵیانە، نوری دیدەیانە، چێژی دەروونیانە، بەهەشتی ئەندامەکانیانە، ئەوانە لەنێو نیعمەتدا دەژین.

نوێژی ئەمانە دەبێتە هۆی ئەوەی لە خوداوە نزیک ببنەوە و پێگەی بەرز بەدەست بهێنن، هاوبەشی پێشین دەبن لە پاداشتدا و پێگەیان بەرز دەبێت و لە خوداوە نزیک دەبن، ئەمەیش بەشێکی زیادەیە لەسەرووی پاداشتەکەیانەوە، هەر بۆیە پاشا لە هەرکەسێک ڕازی بێت پاداشتی دەداتەوە و نزیکی دەکاتەوە لە خۆی، وەک چۆن جادووگەرەکان بە فیرعەونیان وت:

﴿ إِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَـٰلِبِينَ ﴿١١٣﴾ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ لَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴾[1]

واتە: پاداشتێکمان دەست دەکەوێت ئەگەر ئێمە بردمانەوە؟!

فیرعەون وتی: بەڵێ، ئێوە لە نزیکان و بەڕێزان دەبن.

ئەم بەندەیە چووەتە نێو ماڵی پاشا و بەربەستەکەی نێوانیانی لا داوە، چاوی گەش بووە و دەروونی ئارام بووە، دڵ و ئەندامەکانی بۆی کەچ بووە، وەها خودای پەرستووە وەک ئەوەی دەیبینێت و لە وتەکانیدا خۆی بۆ دەر خستووە.

ئەمە ئاماژە و پوختەیەک بوو لە چێژی نوێژدا.

---

(١) سورة الأعراف، الآيتان: ١١٣،١١٤

## ئیبن قەییم لەلای ئایەتی

## ﴿ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾

## ئـاوای فەرمـوو...

### بەرپاکردنی نوێژ

فەرمانمان پێ کراوە نوێژەکانمان بەرپا بکەین، بە جوانترین شێواز بەرپای بکەین لە وەستان و ڕکوع و سوجدە و زیکرەکان، خودای گەورە ڕزگاربوونی پەیوەست کردووە بە خشوعی نوێژخوێن لەناو نوێژەکەیدا، هەرکەسێک خشوعی لەدەست بچێت، لە ئەهلی ڕزگاربوون نییە، مەحاڵیشە خشوع لەگەڵ پەلەپەلیدا بێتە دی، بەڵکوو خشوع تەنها لەگەڵ سرەوتندا دێتە دی، هەتا سرەوتن و ئارامبوون زیاتر بێت، خشوعیش زیاتر دەبێت، هەردەمێکیش خشوعی کەمتر بێت، خێراییەکەی زیاتر دەبێت، هەتا جووڵەی دەستی وەک گاڵتەکردنی لێ دێت کە نە خشوعە، نە ڕووکردنە خودایە، نە ناسینی مافی بەندایەتییە، خودای گەورەیش فەرموویەتی:

﴿وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ﴾[١] ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ﴾[٢] ﴿وَأَقِمِ الصَّلَوٰةَ﴾[٣]

---

(١) سورة البقرة، الآية: ٤٣

(٢) سورة المائدة الآية: ٥٥

(٣) سورة العنكبوت، الآية: ٤٥

(فَإِذَا اطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ)[١](وَالْمُقِيمِينَ الصَّلَاةَ)[٢]

ئیبراهیم فەرمووی: (رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصَّلَاةِ)[٣]

مووسا فەرمووی: (فَاعْبُدْنِي وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي)[٤]

له هەرشوێنێکی قورئاندا باسی نوێژ کراوە، ئیللا لەگەڵیدا باسی بەرپاکردنی هاتووە، نوێژخوێن کەمە، ئەوەی نوێژەکەی بەرپا دەکات و کاری پێ دەکات و نوێژچاکە هەر زۆر کەمە، وەک پێشەوا عومەر فەرمووی: حاجی کەمە و سواری زۆرە.

---

(١) سورة النساء، الآية: ١٠٣

(٢) سورة النساء، الآية: ١٦٢

(٣) سورة إبراهيم، الآية: ٤٠

(٤) سورة طه، الآية: ١٤

## جۆرەکانی نوێژخوێن

هەندێک لەنوێژخوێنەکان دەڵێن: هێندە بەسە ناوەکەی لەسەر جێبەجێ ببێت، خۆزگە ئەنجامدمان دەدا، گەر ئەوانە بیانزانییایە کە فریشتەکان نوێژەکانیان بەرز دەکەنەوە، دەیخەنە بەردەم خودای گەورە وەک ئەو دیارییانەی خەڵکی لە ڕێیەوە خۆیان نزیک دەکەنەوە لە پاشا و گەورەکانیان، ئەو کەسەی چووە بۆ باشترین ئەو شتەی کە لەتوانایدایە، بەپێی تواناییش جوان و باشی کردووە، دواتر بەمە خۆی نزیک کردووەتەوە لەو زاتەی ئومێدی پێی هەیە و لێی دەترسێت، وەک ئەو کەسە نییە چووە بۆ خراپترین شت لەلای، بۆ ئەوەی ئیسراحەت بکات لە دەستی، دواتر ناردوویەتی بۆ لای کەسێک کە پێگەی نییە لەلای، ئەو کەسەی نوێژ بەهاری دڵی و ژیانیەتی، ئیسراحەت و نوری دیدەیەتی، لابەری خەم و خەفەتیەتی، پەناگەیەتی لە کاتی نارەحەتی و سەختیدا، وەک ئەو کەسە نییە کە نوێژ کۆتە بۆ دڵ و ئەندامەکانی، وەک ئەرک وایە لەسەری و قورسە بۆی، لەسەر ئەم زۆر قورسە، بەڵام بۆ کەسەکەی تر نوری دیدە و ئیسراحەتە.

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلۡخَٰشِعِينَ ٤٥ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمۡ وَأَنَّهُمۡ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ﴾[1] واتە: پەنا ببەنە بەر ئارامگرتن و نوێژ، بێگومان نوێژ ئەرکێکی گەورە و گرانە، مەگەر لای ئەوانە نەبێ کە لە خودا دەترسن. ئەوانەی کە پێیان وایە بێگومان بە خزمەت پەروەردگاریان دەگەن، ئەوان دڵنیان بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە.

---

(١) سورة البقرة، الآيتان: ٤٤-٤٥

لەلایان گەورە و گران بووە چوونکە دڵیان خاڵییە لە خۆشەویستی و بەگەورەدانانی خودا، دڵیان خاڵییە لە ملکەچبوون بۆی و ئومێدبوون پێی، ئامادەگیی بەندە لە نوێژدا و ملکەچبوون تێیدا و بەتەواوی بەجێگەیاندنی و بەرپاکردنی بە ئەندازەی ئومێدبوونیەتی بە خودا.

## بەهای نوێژ

ئیمامی ئەحمەد دەفەرموویێت: بەشیان لە ئیسلام بە ئەندازەی بەشیانە لە نوێژ، ئارەزوویان لە ئیسلام بە ئەندازەی ئارەزوویانە لە نوێژ، ئەی بەندەی خودا خۆت بناسە، بترسە لەوەی بگەیتە خودا و بەشت لە ئیسلامدا نەبێت، بەشی ئیسلام لە دڵتدا بە ئەندازەی بەشی نوێژە لە دڵتدا.[1]

بەشی ئەو دڵەی کە ئاوەدانە بە خۆشەویستیی خودا و ترس و ئومێدبوون پێی و بەگەورەدانانی لە نوێژدا، وەک بەشی ئەو دڵە نییە کە خاڵییە لەو شتانە و وێرانە، کە ئەو دوو دڵە لە بەردەم خودادا وەستان، ئەو کەسە بە دڵێکەوە دەوەستێت کە ملکەچە بۆ خوا و نزیکە لێی، سەلامەتە لە شتە خراپەکان، هەموو لاکانی پڕ کردووە لە هەیبەت، نوری ئیمان تێیدا شەوق دەداتەوە، بەربەستی دەروون و دووکەڵی شەهەواتی لا چووە، لە باخچەی واتاکانی قورئاندا چێژ وەر دەگرێت، دڵی تێکەڵ بووە بە شادومانیی باوەڕبوون بە حەقیقەتی ناو و سیفاتە بەرزەکانی خودا، بە جوانی و کامڵبوونە مەزنەکەی، هەموو خەمی خودایە، چاوڕۆشن بووە پێی، هەستی بە نزیکییەک کردووە لە خوداوە، نزیکبوونێک کە هاوشێوەی نییە، دڵی بۆ یەکلا کردوەتەوە و بە هەموو بوونیەوە ڕووی تێ کردووە، ئەم ڕووتێکردنەی لەنێوان دوو ڕووتێکردنی پەروەردگاریەتی، سەرەتا خودا ڕووی تێ کردووە، بە ڕووتێکردنەکەی دڵی کەمەندکێشی لای خۆی کردووە، کە ڕووی کردە پەروەردگاری، ڕووتێکردنێکی تری پێ دەبەخشێت کە لەوەی یەکەم تەواوترە.

---

(١) طبقات الحنابلة: (٣٥٤/١)

## دەستپێکی نوێژ

لێرەدا یەکێک لەشتە سەرسووڕهێنەرەکانی ناو و سیفاتە بەرزەکانی خودا دێتە دی، بۆ ئەو کەسەی دڵی تێگەیشتووە لە واتاکانی قورئان و ڕووناکیی باوەڕپێبوونی لەگەڵ دڵیدا تێکەڵ بووە، بە جۆرێک بۆ هەموو ناو و پەسنێک شوێنێک دەبینێت لە نوێژەکەیدا.

کە لە بەردەم پەروەردگاریدا وەستا، بە دڵی ڕاوەستاویی خودا و بەڕێوەبردنی کاروباری هەموو ئافرێندراوەکان دەبینێت.

کە وتی (الله أكبر)، مەزنی و گەورەییەکەی دەبینێت.

کە وتی: (سُبحانَكَ اللهُمَّ وبِحَمْدِكَ. وتَبارك اسمُكَ، وَتَعالى جَدُّكَ، وَلا إلَه غَيرُكَ)[1]، بە دڵی پەروەردگارێک دەبینێت کە پاک و بێگەردە لە هەموو نەنگییەک، سەلامەتە لە هەموو کەموکورتییەک، بە هەموو جۆرێک سوپاس و ستاییش کراوە، سوپاس و ستاییشکردنەکەی پەسنکردنی بە هەموو کامڵبوونێک دەگرێتەوە، هەروەها (وتَبارك اسمُه) بەریی دەکات لە هەموو کەموکورتییەک، ناوی ئەو زاتە لەسەر کەم بهێنرێت زۆر دەبێت، لەسەر خێر بهێنرێت ئیللا گەشەی پێ دەکات و بەفەڕی دەکات، لەسەر هەر دەردێک بهێنرێت ئیللا لای دەبات، لەسەر شەیتانیش بهێنرێت بە ڕسوایی و شکستەوە دەگەڕێتەوە، تەواویی ناو لە تەواوێتیی ناونراوەکەوەیە، کە ئەمە پێگە و پایەی ناوەکەی بێت کە لەگەڵیدا هیچ شتێک لە ئاسمان و زەویدا زیانت پێ ناگەیەنن، ئەوا پێگە و پایەی ناونراوەکە بالاتر و مەزنترە.

---

(١) رواه مسلم ( ٣٩٩)

(وَتَعالى جَدُّكَ) واتە: مەزنی و گەورەییەکەی بەرز و بڵندە و سەرکەوتووە بەسەر هەموو مەزنییەکدا، پێگەکەی بەرز بووەتەوە بەسەر هەموو پێگەیەکدا، دەسەڵاتەکەی زاڵە بەسەر هەموو دەسەڵاتێکدا، دەسەڵاتی گەورە و مەزنە لەوەی هاوبەشی هەبێت لە موڵکیدا یان لە خوداوەندیدا، یان لە کردەوە و سیفاتەکانیدا، وەک چۆن پەرییە باوەڕدارەکە وتی:

﴿وَأَنَّهُۥ تَعَٰلَىٰ جَدُّ رَبِّنَا مَا ٱتَّخَذَ صَٰحِبَةً وَلَا وَلَدًا﴾[1]

واتە: پەروەردگاری پایەبڵندمان مەزن و گەورەیە، ئەو زاتە نە هاوسەری بڕیار داوە، نە نەوە.

لەم وشانەدا چەندین حەقیقەتی ناو و سیفاتە بەرزەکانی خودا بەدەر کەوتووە لەسەر ئەو دڵەی کە دەیزانێت و حەقیقەتەکانی پەک نەخستووە.

### پەناگرتن بە خودا

کە وتی: (أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيمِ)، پەنای بردووە بۆ گۆشە بەهێزەکەی خودا، پشتی بەستووە بە هەوڵ و توانای خودا لەو دوژمنەی کە دەیەوێت لە پەروەردگاری دای ببڕێت و لە نزیکبوون لێی دووری بخاتەوە، بۆ ئەوەی بچێتە خراپترین دۆخەوە.

---

(١) سورة الجن، الآية: ٣

﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾

که دەڵێت: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، کەمێک دەوەستێت و چاوەڕێی وەڵامی پەروەردگاری دەکات کە دەفەرمووێت: (بەندەکەم سوپاسی کردم) کە دەڵێت: ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، چاوەڕێی وەڵامی پەروەردگاری دەکات کە دەفەرمووێت: (بەندەکەم ستاییشی کردم)، کە دەڵێت: ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾، چاوەڕێی وەڵامی پەروەردگاری دەکات کە دەفەرمووێت: (بەندەکەم ڕێزی لێ گرتم). ئای لە چێژی دڵی و چاوگەشی و خۆشیی دەروونی بە وتەی پەروەردگاری: (بەندەکەم) کە سێ جار دەیڵێتەوە، وەڵڵاهی گەر دووکەڵی شەهەوات و هەوری دەروون لەسەر دڵەکان نەبووایە، دڵخۆشی و ئاسوودەیی زاڵ دەبوو بەسەریدا بە هۆی وتەی پەروەردگار و ئافرێنەر و پەرستراوی: (بەندەکەم سوپاسی کردم)، (بەندەکەم ستاییشی کردم)، (بەندەکەم ڕێزی لێ گرتم).

دواتر بوار هەیە بۆ دڵی بۆ بینینی ئەم سێ ناوە کە بنچینەی هەموو ناوە جوانەکانی خودان، کە بریتین لە: (الله، رب، الرحمن) لە باسکردنی ئەو ناوانەدا بە دڵی پەروەردگارێکی پەرستراوی مەوجوودی بینی، تەنها ئەو شاییستەی پەرستشە، ڕوخسارەکان بۆی کەچن، هەموو بوونەوەر بۆی کەچن، دەنگەکان بۆی نەوین:

﴿تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبْعُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ۚ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ﴾[1]، واتە: هەر حەوت ئاسمانەکان و زەوی و هەموو ئەوانەی کە تیایاندا هەن، تەسبیحات و ستاییشی ئەو زاتە دەکەن، هیچ شتێک نییە لەم بوونەوەرەدا کە تەسبیحات و ستاییش و سوپاسی ئەو زاتە نەکات.

---

(١) سورة الإسراء، الآية: ٤٤

﴿وَلَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ كُلّٞ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ﴾[١]، واتە: ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەویدایە تەنیا هیی خودایە، هەموویان هەر بۆ خودا گەردنکەچن.

بە هەمان شێوە ئاسمان و زەویی ئافراندووە لەگەڵ ئەوەیشی لەنێوانیاندایە، پەری و مرۆڤ و باڵندە و ئاژەڵ و بەهەشت و دۆزەخی ئافراندووە، پێغەمبەرانی ناردووە، کتێبی دابەزاندووە و شەریعەتی داناوە، بەندەکانی پەیوەیست کردووە بە فەرمان و ڕێگرییەوە. دواتر لە کاتی وتنی: ﴿رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾، پەروەردگارێک دەبنینێت کە ڕاوەستاوە بە زاتی خۆیەوە، ڕاگری هەموو شتێکە، سەرپەرشتیار و ڕاگیرکاری هەموو نەفسێکە بە خێر و شەڕیەوە، چووەتە سەر عەرشەکەی، بەتەنها کاروباری بەندەکانی بەڕێوە دەبات، بەڕێوەبردن هەمووی بەدەست ئەوە، سەرەنجامی هەموو کارەکانیش بۆ لای ئەوە، مەڕاسیمی بەڕێوەبردن لەلای ئەوەوە دادەبەزێت لەسەر دەستی فریشتەکانی بە بەخشین و گرتنەوە، بە نەویکردن و بەرزکردنەوە، بەمردن و ژیانەوە، بە تەوبەکردن و دوورخستنەوە، بە ڕۆزیگرتنەوە و بە فراوانکردنی ڕۆزی، دوورخستنەوەی ناڕەحەتی و بەهاناهانتی تامەزرۆکان و وەڵامدانەوەی لێقەوماوەکان: ﴿يَسۡـَٔلُهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ كُلَّ يَوۡمٍ هُوَ فِي شَأۡنٖ﴾، واتە: ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەویدایە داوای پێویستییان لە خودا دەکەن، هەموو ڕۆژێک بە کارێکەوە خەریکە.

بە هەرکەسێکی بەخشی کەس ناتوانێت ڕێگریی بکات، لە هەرکەسێکیشی گرتەوە کەس ناتوانێت پێی ببەخشێت، تێهەڵچوونەوە بە بڕیارەکانیدا نییە، فەرمانەکانی ڕەت ناکرێتەوە، وتەکانی گۆڕانی بەسەردا نایەت، فریشتەکان و جبریل بەرز دەبنەوە بۆ لای، سەرەتا

---

(١) سورة الروم، الآية: ٢٦

و کۆتایی ڕۆژ کردەوەی بەندەکانی پیشان دەدرێت، چارەنووس و قەدەر دیاری دەکات، کاتیش بۆ ڕوودانیان دادەنێت، دواتر چارەنووس و قەدەرەکە دەبات بەرەو کاتەکەی، هەموو ئەمانە بەڕێوە دەبات لەگەڵ پاراستنی و بەرژەوەندییەکانی.

﴿ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾

دواتر لە کاتی ناوهێنانی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ پەروەردگارێک دەبینێت کە باشە بۆ بەندەکانی بە هەموو جۆرەکانی باشبوون، جۆرەها نیعمەتی ڕژاندووە بەسەریاندا، ڕەحمەت و زانستەکەی هەموو شتێکی گرتووەتەوە، هەموو ئافرێندراوێک بەهرەمەند بووە لە نیعمەت و فەزڵەکەی، ڕەحمەتەکەی هەموو شتێکی گرتووەتەوە، نیعمەتەکانی هەموو زیندووەیەکی گرتووەتەوە، ڕەحمەتەکەی گەیشتووە بەو شوێنەی کە زانستەکەی پێی گەیشتووە، بە ڕەحمەتی خۆی چووەتە سەر عەرشەکەی، بە ڕەحمەتی خۆی بوونەوەری ئافراندووە و کتێبەکانی دابەزاندووە، بە ڕەحمەتی خۆی پێغەمبەرانی ناردووە و شەریعەتی داناوە، بەهەشت و دۆزەخی بە ڕەحمەتی خۆی ئافراندووە، ئەو قامچییەیە کە بەندە باوەڕدارەکانی پێ دەبات بەرەو بەهەشت، تاوانی یەکخواناسەکانی پێ لا دەدات، ئەو زیندانەیە کە دوژمنەکانی تێدا زیندانی دەکات.

ڕامێنە لەو ڕەحمەتەی کە لە فەرمان و ڕێگری و ئامۆژگارییەکانیدایە، لەو نیعمەتە فراوانەی تێیدایە، ڕامێنە لەو ڕەحمەت و نیعمەتەی لەناویدایە، ڕەحمەت هۆکارێکە بۆ پەیوەستبوون لەگەڵ بەندەکانیدا، وەک چۆن بەندایەتی هۆکارێکە بۆ پەیوەستبوون پێوەی، لەمان بەندایەتی و لەویش ڕەحمەت.

لە تایبەتترین دیمەنی ئەم ناوە، ئەوەیە نوێژخوێن بەشی خۆی ببینێت لەو ڕەحمەتەی کە وای لێ کردووە لە بەردەم پەروەردگاریدا بوەستێت، بە شایانی ئەوەی زانیوە بەندایەتیی بکات و موناجاتی لەگەڵ بکات، بەمی بەخشیوە و لە یەکێکی تری گرتۆتەوە، دڵی ڕوو کردووەتە خۆی و دڵی کەسێکی تری وەر چەرخاندووە، ئەمە لە میهری خودایە بۆی.

﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾

که دەڵێت: ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾، لێرەدا شکۆمەندییەک دەبینێت کە تەنها شایستەیە بە پەروەردگاری پادشای حەق، پاشایەکی بەهێز دەبینێت، هەموو ئافرێندراوەکان بۆی کەچن، ڕوخسارەکان بۆی نەوین، هەموو ملهوڕەکان بۆ مەزنییەکەی زەلیل بوون، هەموو بەهێزێک کەچ بووە بۆ بەهێزییەکەی، بە دڵی پادشایەک دەبینێت کە لەسەر عەرشەکەیەتی، بۆ عیززەتەکەی ڕوخسارەکان کەچ دەبن و سوجدە دەبەن، ئەگەر حەقیقەتی سیفەتی (الملک) پەک نەخات، ئەوا حەقیقەتی ناو و سیفاتەکانی دەبینێت، کە پەککستنی، پەککستنی پادشایەتییەکەیەتی و نکوڵیکردنیەتی، پاشای حەق و خاوەن پاشایەتیی تەواو: بەدی نایەت ئیللا دەبێت زیندوو بێت، ڕاگر و سەرپەرشتیاری دروستکراوەکانی بێت، بینەر و بیسەر بێت، بەتوانا بێت و توانای گۆکردنی هەبێت، فەرمان و ڕێگری دەر بکات، لەسەر تەختی دەسەڵاتەکەی بێت و زاڵ بێت، فەرمانەکانی بنێرێت بۆ ئەوسەری مەملەکەتەکەی، ڕازی بێت لەوەی شایستەی ڕازیبوونە، ستاییشی بکات و ڕێزی لێ بگرێت و نزیکی بکاتەوە، هەروەها تووڕە بێت لەوەی شایستەی تووڕەبوونە، سزای بدات و سووکی بکات و دووری بخاتەوە، کێی ویست سزای بدات، ڕەحمیش بەوە بکات کە ویستی لێیەتی، ببەخشێت بەوەی ویستی لێیەتی، ئەوەیش نزیک بکاتەوە کە ویستی لێیەتی، شوێنی سزای هەیە کە دۆزەخە، شوێنی بەختەوەربوونی هەیە کە بەهەشتە، هەرکەسێک شتێک لەمانە بەتاڵ بکاتەوە، یان نکوڵیی حەقیقەتەکەی بکات، ئەوا تانەی داوە لە پاشایەتیی خودا و کامڵبوون و تەواوێتییەکەی، هەروەها کەسێک نکوڵیی عمومی قەزاوقەدەرەکەی بکات، ئەوا نکوڵیی گشتگیریی موڵک و کامڵبوونی خودای کردووە، نوێژخوێن شکۆ و مەزنیی پەروەردگاری دەبینێت لە کاتی وتنی: ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾دا.

﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾

که دەڵێت: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾، نهێنی و ڕازی دروستکردن و بڕیاردانی تێدایە، نهێنی و ڕازی دونیا و قیامەتی تێدایە، مەزنترین ئامانج و باشترین ئامرازی لەخۆی گرتووە، مەزنترین ئامانج بەندایەتیکردنیەتی، باشترین ئامرازیش یارمەتییەکەیەتی، تەنها ئەو شاییستەی پەرستشە، تەنها ئەویش یارمەتیدەرە بۆ پەرستشکردنی، بەندایەتیکردنی مەزنترین ئامانجە، یارمەتیدانیشی باشترین ئامرازە، خودا سەد و چوار کتێبی ناردووەتە خوارەوە، واتای هەمووی لە چوار پەرتووکدا کۆ کردووەتەوە، کە بریتین لە: تەورات و ئینجیل، قورئان و زەبور. واتای ئەو چوارەیشی لە قورئاندا کۆ کردووەتەوە، واتای ئەوەیشی لە موفەسەلەکاندا کۆ کردووەتەوە، واتای ئەوەیشی لە فاتیحەدا کۆ کردووەتەوە، واتاکانی سورەتی فاتیحەیشی لە ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ دا کۆ کردووەتەوە.

**ئەم وشەیە دوو جۆر تەوحیدی لەخۆی گرتووە، ئەوانیش:**

١- تەوحیدی ڕبوبیەت.

٢- تەوحیدی ئولوهیەت.

هەروەها پەرستش بە ناوەکانی (رب و الله)ی لەخۆ گرتووە، بە ئولوهیەتەکەی پەرستش دەکرێت و پشت بە ڕبوبیەتەکەی دەبەسترێت، بە ڕەحمەتی خۆی خەڵکی هیدایەت دەدات بۆ ڕێگای ڕاست، یەکەمین سورەتە کە ناوی: (الله، رب، الرحمن)ی تێدا باس کراوە، وەک مەزنترین داواکارییەکان لە پەرستشکردن و پشتپێبەستن و هیدایەتەکەی، تەنها خودا هەموو ئەوانە دەبەخشێت، تەنها ئەویش یارمەتیت دەدات بۆ پەرستشکردنی، تەنها ئەویش هیدایەتت دەدات.

﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾

لە کاتی وتنی: ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾دا، دەبینێت چەندێ پێویست و ئاتاجی ئەم بابەتەیە، بۆ هیچ شتێکی تر هێندە ئاتاج نییە، لە هەموو هەناسەیەک و چاوترووکاندێکدا پێویستی پێیەتی، ئەمەش داواکراوە لەم دوعایەدا، کە تەواو نابێت ئیللا بە هیدایەتدان نەبێت بۆ ئەو ڕێگایەی کە دەگات بە خودا و هیدایەتوەرگرتنیش لەو ڕێگایەدا، کە ئەویش هیدایەتە لە وردەکارییەکاندا و بوونی توانایە لەسەر کردەوە و ویستەکەی و ئەنجامدانی و مۆفەقبوونی بۆ ئەوەی بەو شێوازە بێت کە خودا لێی ڕازییە و پێی خۆشە، هەروەها بیپارێزێت لە تێکدەرەکانی لە کاتی ئەنجامدانی و دوای ئەنجامدانیشی.

## ( آمـین ) کردن

که لەم ستاییش و دوعا و تەوحیدە تەواو دەبێت، بۆی دانراوە ئامین بکات لەسەر ئەوانە، کە وەک لێدانی مۆرێک وایە لێی، کە فریشتەکانی ئاسمان پەسەندیان کردووە، ئەم ئامینکردنە لە جوانکاریی نوێژە، وەک چۆن دەستبەرزکردنەوە جوانکاریی نوێژە، کە شوێنکەوتنی سوننەت و بەگەورەدانانی فەرمانی خودایە، پەرستشی دەستەکانە و دروشمی گواستنەوەیە لە ڕوکنێکەوە بۆ ڕوکنێکی تر.

دواتر موناجات لەگەڵ خودادا دەکات بە وتەکانی و بە گوێگرتن لە ئیمام بە بێدەنگبوونی و ئامادەبوونی دڵی، باشترین زیکری نوێژ زیکری بەپێوەوەستانە، جوانترین شێواز شێوازی وەستانە، هەر بۆیە تایبەت کراوە بە سوپاس و ستاییشکردن و بە مەزندانانی خودا و خوێندنەوەی کەلامەکەی، هەر بۆیە ڕێگریمان لێ کراوە لە ڕکوع و سوجدەدا قورئان بخوێنین؛ چوونکە ئەوە دوو حاڵەتی زەلیلی و ملکەچی و سرەوتن و نەویبوونە، هەر بۆیە بەپێی شێوازەکەی زیکری تایبەت بە خۆی بۆ دانراوە.

## ڕکــوع

ئەو کەسەی دەچێتە ڕکوع، بۆی دانراوە باسی مەزنیی پەروەردگاری بکات لە کاتی نەویبوون و سرەوتن و ملکەچبوونی، خودا پەسن دەکرێت بە مەزنییەک، کە هاوئاهەنگ بێت لەگەڵ شکۆ و گەورەییەکەیدا، باشترین زیکر کە لە ڕکوعدا بوترێت (سبحان ربي العظيم)ە، چوونکە خودا فەرمانی بەمە کردووە، پێغەمبەری خودا ﷺ کە نێردەی نێوان ئەو و بەندەکانیەتی، شوێنی ئەم زیکرەی دیاری کردووە، ئەو دەمەی ﴿فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ﴾ دابەزی، فەرمووی: (بیخەنە ڕکوعەکانتانەوە)[1].

لەلای زۆرێک لە زانایان هەرکەسێک بە قەستی تەرکی بکات، نوێژەکەی بەتاڵە، هەرکەسێکیش بیری بچێت، پێویستە سوجدەی سەهوی بۆ ببات، ئەمە بۆچوونی ئیمامی ئەحمەد و ئەوانەیە کە هاوڕای بوونە لە پێشەوایانی فەرمووده و سوننەت، فەرمانکردنی بەمە هیچی کەمتر نییە لەوەی فەرمانی پێ کراوە لە تەحیاتدا سەڵاوات لەسەر پێغەمبەری خودا بدات، واجببوونی هیچی کەمتر نییە لە واجببوونی دانانی دەست و ناوچاوان لە سوجدەدا، پوختەی قسان: ڕاز و نهێنیی ڕکوع بە گەورەدانانی خودایە بە دڵ و جەستە و قسە، هەر بۆیە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: (ئەمما ڕکوع پەروەردگاری تێدا بەگەورە بزانن)[2].

---

(١) أبو داود (٨٦٩)

(٢) رواه مسلم

## هەستانەوە لە ڕکوع

دواتر سەری بەرز دەکاتەوە و دەگەڕێتەوە بۆ تەواوترین وتەی، دروشمی ئەم ڕوکنە سوپاس و ستاییشکردن و بەگەورەدانانی خودایە، سەرەتای ئەم دروشمە وتەی نوێژخوێنە کە دەڵێت: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، واتە بیستنێک کە بیستنی وەرگرتن و وەلامدانەوەیە، دواتر تکا دەکات بە: (رَبَّنا و لَكَ الحَمْدُ، مِلءَ السّمواتِ وَالأرضِ، وَما بينَهما، وَملءَ ما شِئتَ مِنْ شَيءٍ بَعْدُ)، واوی نێوان ئەو دوو وشەیە فەرامۆش ناكرێت (رَبَّنا ولَكَ الحَمْدُ)، لە هەردوو سەحیحەكەدا هاتووە و وتنی سوننەتە، ئەو واوە وەها دەکات وتەکە وەک دوو ڕستەی سەربەخۆی لێ بێت، وتنی (رَبَّنا) واتە تۆ پەروەردگار و پاشایەكی ڕاوەستاوی کە جڵەوی هەموو کارەکانی بەدەستە، هەموو کارەکانیش دەگەڕێتەوە بۆ لای، دواتر عەتفکردنی (رَبَّنا) بۆ سەر (وَلَكَ الحَمْدُ)، واتای ئەوە لەخۆی دەگرێت موڵک و سوپاسگوزاری بۆ خودایە، خودایە سوپاسمان کردیت و سوپاسگوزارییش هەر بۆ تۆیە.

دواتر باسی پێگەی ئەم سوپاسە دەکات، باسی مەزنی و پەسنەکەی دەکات، دەڵێت: (مِلءَ السّمواتِ وَالأرضِ، وَما بَينَهُما، وَمِلءَ ما شِئتَ مِنْ شَيءٍ بَعْدُ)، واتە: پڕ بە جیهانی سەرەوە و خوارەوە و فەزای نێوانیشیان، ئەم سوپاس و ستاییشە هەموو بوونەوەری گرتۆتەوە، ئەوەش پڕ دەکات کە دواتر خودا دەیئافرێنێت و ویستی لێیەتی، سوپاس و ستاییشی هەموو مەوجوودێکی پڕ کردووە، ئەوەیشی کە دێتە بوون. ئەمە باشترین دیاریکردنیەتی، وتراوە: هەرشتێکت ویست لەودیو جیهانەوە، ئەو دەمە وشەی (بعد) لە یەکەمدا بۆ زەمانە و لە دووەمدا بۆ مەکانە.

دوای ئەوە دەڵێت: (أهلَ الثَّناءِ والمَجدِ)، بەمەیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە نوێژەکەی پێ دەست پێ کرد، لە سوپاس و ستاییشکردن

و بەگەورەدانانی خودا، دواتر دەڵێت: (أحَقُّ ما قالَ العَبْدُ وَكُلُّنا لَكَ عَبْدٌ) وەک دانپێدانان بە سوپاس و ستاییشکردن و بەگەورەدانانی خودا، ئەمەیش ڕەواترین شتە کە بەندە وتوویەتی، دوای ئەمەیش دانی نا بە بەندایەتیدا، ئەمەیش بڕیارێکی گشتییە بۆ هەموو بەندەکان، دواتر دەڵێت: (اللهُمَّ لا مانِعَ لِما أعطيتَ، وَلا مُعطيَ لِما مَنَعْتَ، وَلا يَنفَعُ ذا الجدِّ مِنكَ الجَدُّ)[١] لەدوای تەواوبوون لەنوێژ هەمان شت دەڵێت، لەم دوو شوێنەدا دان دەنێت بە تاک و تەنهاییەکەیدا و هەموو نیعمەتەکانیش لەوەوەیە، ئەمەیش چەند شتێک لەخۆی دەگرێت:

**یەکەمیان:** تاک و تەنهایە لە بەخشین و گرتنەوەدا.

**دووەمیان:** کە خودا بەخشی بە یەکێک، هیچ کەسێک ناتوانێت ڕێگری بکات لەو بەخشینە، کە گرتیەوە، کەس ناتوانێت ئەو شتە ببەخشێت کە گرتوویەتیەوە.

**سێیەمیان:** ڕەچەڵەک و بەشیان لە دەسەڵات و موڵک و سەرۆکایەتی و زەنگینی و خۆشگوزەرانی و شتی تریش، لەلای خودا هیچ سوودێک ناگەیەنێت، لە سزاکەی ڕزگاری ناکات، لەو نزیکی ناکاتەوە، بەڵکوو تاعەت و ئەنجامدانی ئەوەی پێی ڕازییە سوودی پێ دەگەیەنێت.

دواتر کۆتایی بەمە دەهێنێت بە: (اللهُمّ اغسِلْني مِنْ خَطايايَ بِالثَّلْج وَالماءِ وَالبَرَدِ)[٢]، وەک چۆن بەمە دەستی کرد بە ڕکاتەکە، هەروەها نوێژەکەیشی بە داوای لێخۆشبوون کۆتایی پێ دەهێنێت، لە سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایی نوێژەکەیدا داوای لێخۆشبوون دەکات، ئەم

---

(١) رواه مسلم (٤٧١)

(٢) رواه مسلم (٤٧٦)

ڕوکنە باشترین زیکر و بەسوودترین دوعای لەخۆ گرتووە: لە سوپاس و ستاییشکردن و بەگەورەدانانی خودا، داننان بە بەندایەتی و یەکتاپەرستی و پاکبوونەوە لە تاوان و هەڵەکانی، ئەم زیکرە خودی خۆی مەبەستە لە ڕوکنێکی دیاریکراودا، کە جیایە لە ڕکوع و سوجدە.

## سوجده

دواتر (اللهأكبر) دەکات و دەچێتە سوجدە و دەستەکانی بەرز ناکاتەوە، چوونکە هەردوو دەست دەچنە سوجدە وەک چۆن ڕوخسار دەچێت، نەوی دەبن بۆ پەرستشەکەیان، ئەمەیش وای کردووە کە بەرزی نەکاتەوە، هەر بۆیە لە کاتی هەستانەوە لە سوجدەیش دەستی بەرز ناکاتەوە؛ چوونکە لەگەڵیدا بەرز دەبنەوە، وەک چۆن لەگەڵیدا دادەنرێت، سوجدە لە کامڵترین شێواز و ئەوپەڕی بەندایەتیدا دانراوە (لە هەمووشیان زیاتر ئەندامەکان لە پەرستشدایە، بە جۆرێک، هەموو بەشێک لە جەستە پشکی خۆی وەر دەگرێت لە بەندایەتیکردن.)

سوجدە نهێنی و ڕازی نوێژە، مەزنترین ڕوکنیەتی و کۆتایی ڕکاتە، ڕوکنەکانی پێشووی وەک پێشەکییەک وایە بۆی، وەک تەوافکردنی زیارەت وایە لە حەجدا، ئامانجی حەجە و شوێنی چوونە خزمەت خودا و زیارەتکردنیەتی و ئەوەی پێش ئەوە دێت وەک پێشەکییەک وایە بۆی.

هەر بۆیە بەندە لە سوجدەدا لە هەموو کات زیاتر لە خوداوە نزیکترە، باشترین دۆخیش ئەو دۆخەیە کە لە خوداوە نزیکترە، هەر لەبەر ئەمەیش دوعا لەم دۆخەدا نزیکترە لە وەڵامدانەوە.

## ئەسڵی مرۆڤ

خودا مرۆڤی لە زەوی ئافراندووە، هەر بۆیە شایستەیە بەوەی لە ئەسڵی خۆی دەر نەچێت، بەڵکوو بگەڕێتەوە بۆ لای گەر تەبیعەت و نەفسی ئەوەیان خواست لێی دەر بچێت، چوونکە مرۆڤ گەر تەبیعەت و داخوازییەکانی نەفسی ڕەها بکات، لووتبەرزی دەنوێنێت و خراپ دەبێت، لەو ئەسڵە دەر دەچێت کە لێی ئافرێندراوە، باز دەدات بەسەر مافی پەروەردگاریدا لە گەورەیی و مەزنی، لەو دووانە دای دەبڕێت، لەبەر ئەوە فەرمانی پێ کراوە سوجدە ببات وەک ملکەچییەک بۆ مەزنیی پەروەردگار و ئافرێنەری، وەک خشوع و زەلیلبوون لە بەردەمیدا، خۆشکاندن بۆی، ئەم خشوع و ملکەچی و زەلیلبوونە دەیگەڕێنێتەوە بۆ بەندایەتیکردن، دەگاتەوە بەوەی بە هۆی بێئاگایی و پشتهەڵکردنەوە تووشی هاتبوو، کە لە ئەسڵەکەی دەری کردبوو.

پەیڕەویی حەقیقەتی ئەو خۆڵەی کرد لێی ئافرێندراوە، بەڕێزترین و بەرزترین شت تێیدا کە ڕوخسارە دەیخاتە سەر زەوی، لە بەردەم خودادا بەرزترین شتی بەملکەچییەوە بۆ نەوی کردووە، بە ملکەچبوون بۆی و زەلیلبوون بە مەزنییەکەی و ملدان بۆ بەهێزییەکەی، ئەمەش ئامانجی خشوعی ڕووکەشە، خودا لە زەوی ئافراندوویەتی کە زەلیلە بۆ پێنان پێیدا، بەکاری هێناوە تێیدا، دەیگەڕێنێتەوە بۆ ناوی و بەڵێنیشی داوە لەوەوە دەری دەکاتەوە، باوک و دایک و ئەسڵ و فەسڵیەتی، بەزیندووی لەسەریەتی، بەمردووی لە سکیدایە، پاکە و کراوە بە مزگەوت بۆی، فەرمانی پێ کراوە بە سوجدەبردن، کە ئامانجی ملکەچبوونی ڕووکەشە، بەندایەتیی سەرجەم ئەندامەکانی

لەخۆ گرتووە، ڕوخساری دەگەوزێنێت لە خۆڵدا وەک ملدان و خاکیبوون و ملکەچی بۆ خودا.

مەسروق بە سەعیدی کوڕی جوبێری وت: هیچ شتێک نەماوە ئارەزوومان بۆی هەبێت، ئیللا ئەوە نەبێت ڕوخسارمان بگەوزێنن لە خۆڵدا بۆی[١].

---

(١) أخرجه أحمد في الزهد (٢٠٦٥)

## سوننەتەکانی سوجدە

پێغەمبەری خودا ﷺ لە کاتی سوجدەدا ڕووی لە زەوی نەدەپاراست، بەڵکوو گەر بۆی بهاتایەتە پێش، ئەنجامی دەدا، هەر بۆیە لەنێو قوڕاودا سوجدەی بردووە[١].

لەبەر ئەمەیش لە کامڵیی سوجدە ئەوەیە لەسەر حەوت ئەندام سوجدە ببرێت: (ناوچەوان و لووت، هەردوو دەست، هەر دوو ئەژنۆ، سینگەپێ)، ئەمە فەرزە و خودا و پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرمانیان پێی کردووە و پێغەمبەریش گەیاندوویەتی بە ئوممەتەکەی.

لە کامڵبوونی واجبەکە یان سوننەتەکەی ئەوەیە:

ڕوخساری بدات لە زەوی و ئیعتماد بخاتە سەر زەوی، بە جۆرێک قورسایی سەری بخاتە سەر زەوی و پشتیشی بەرزتر بێت لە ئاستی سەری، ئەمە لە تەواوێتیی سوجدەیە.

لە کامڵبوونی سوجدە ئەوەیە لەسەر شێوازێک بێت کە هەموو ئەندامەکانی جەستە پشکی هەبێت لە ملکەچی، سکی لە ڕانی جیا بێت، ڕانی لە پێیەکانی جیا بێت، هەردوو دەستی کەمێک دوور بێت لە لەلاکانی، ڕای نەخات لەسەر زەوی، بۆ ئەوەی هەموو ئەندامەکانی بەندایەتیی خۆی بەر بکەوێت.

هەر بۆیە کە شەیتان دەبینێت نەوەی ئادەم سوجدە دەبات، دەچێتە سووچێکەوە دەگری و دەڵێت: فەرمانی پێ کرا سوجدە ببات، سوجدەی

---

(١) رواه البخاري و مسلم

برد، بەهەشتی بۆ هەیە، فەرمانم پێ کرا سوجدە ببەم، سوجدەم نەبرد، دۆزەخم بۆ هەیە[١].

خودا ستاییشی ئەوانەی کردووە کە گوێبیستی وتەی خودا دەبن و دەکەونە سوجدە، سەرکۆنەی ئەوانەیشی کردووە کە سوجدە نابەن لەو دەمەدا، هەر لەبەر ئەمەیش وتەی ئەوانە بەهێزترە کە بە واجبی دەزانن، ئەو دەمەی ساحیرەکان ڕاستگۆیی موسا و درۆزنیی فیرعەونیان زانی، سوجدەیان بۆ پەروەردگاریان برد، ئەم سوجدەیە سەرەتای بەختەوەری و لێخۆشبوونیان بوو لەو تەمەنەی لە جادوودا بەسەریان بردبوو، خودا باسی هەموو ئافرێندراوەکانی کردووە کە سوجدەی بۆ دەبەن، دەفەرمووێت: ﴿وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَا فِي السَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي لأرضِ مِن دَآبَّة وَلمَلَٰٓئِكَةُ وَهُم لَا يَستَكبِرُونَ (٤٩) يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوقِهِم وَيَفعَلُونَ مَا يُؤمَرُونَ﴾[٢]

واتە: هەرچیی لە ئاسمانەکان و هەرچیی لە زەویدا هەیە سوجدە دەبەن بۆ خودای بەدیهێنەریان، هەروەها هەموو زیندەوەران، فریشتەکانیش بەتایبەت سوجدە دەبەن بۆ خودا و خۆ بە گەورە نازانن، لە هیچ فەرمانێکی خوا لا نادەن.

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسْجُدُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلْجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ ۗ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا

---

(١) رواه مسلم (٨١)

(٢) سورة النحل الآيتان: ٤٩-٥٠

﴿...يَشَآءُ﴾[١] واتە: ئایا نەتبینیوە و نەتبیستووە کە هەرکەس و هەرچیی هەیە لە ئاسمانەکان و زەویدا سوجدە بۆ خوا دەبەن، هەروەها خۆر و مانگ و ئەستێرە و چیاکان و درەخت و ماڵات و زۆرێک لە خەڵکی، زۆرێکیش خۆی شاییستەی سزا و تۆڵە کردووە، جا ئەوەی خودا قەدر و ڕێزی بشکێنێت و ڕیسوای بکات، ئەوە هیچ ڕێزلێنەرێکی نییە، بەڕاستی خودا ئەوەی بیەوێت دەیکات.

ئەوەی شاییستەی سزایە، ئەو کەسەیە کە سوجدە بۆ خودا نابات، خودا ڕیسوای کردووە بەوەی مۆفەقی نەکردووە سوجدە ببات، هەواڵی پێ داوین کە هیچ ڕێزلێنەرێکی نییە، ڕیسوا بووە بەلای خوداوە چوونکە سوجدەی نەبردووە، خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَظِلَٰلُهُم بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْآصَالِ﴾[٢] واتە: هەرچیی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، لەسەر ڕەزامەندیی خۆیان بێت یان بەناچاری، سوجدە بۆ خوای بەدیهێنەر دەبەن، هاوڕێ لەگەڵ سێبەرەکانیاندا لە بەرەبەیان و دەمەوئێواراندا.

(١) سورة الحج، الآية: ١٨

(٢) سورة الرعد، الآية: ١٥

## دووبارەبوونەوەی سوجدە

پەرستش ئامانجی کامڵبوونی مرۆڤە، نزیکبوونەوەی لە خودا بە ئەندازەی پەرستشکردنیەتی، نوێژیش کۆکەرەوەی پەرستشە بڵاوەکانە، بەشەکانی لەخۆ گرتووە، باشترین کردەوەی بەندەکانە، پێگەی لە ئیسلامدا وەک پایەی ڕاگر وایە تێیدا، سوجدەیش باشترین ڕوکنە کردارییەکانە، ئەو ڕازەیە کە لە پێناویدا دانراوە، لە هەموو ڕوکنەکان زیاتر دووبارە بووەتەوە، کۆتایی ڕکات و ئامانجیەتی، سوجدەبردن لەدوای ڕکوعە، ڕکوع وەک پێشەکییەک وایە لە بەردەمیدا، سوپاس و ستاییشی خوای تێدا دانراوە بەو جۆرەی کە شایستەیەتی، ئەویش ئەوەیە بڵێت: (سبحان ربي الأعلى)، ئەمە باشترین شتە کە تێیدا بوترێت، پێغەمبەری خوداﷺ تەنها فەرمانی بەمە کردووە بکرێتە سوجدەوە، فەرموویەتی: (بیکەنە سوجدەکانتانەوە)[١]، هەرکەسێکیش بەقەستی وازی لێ بهێنێت، لەلای زۆربەی زانایان نوێژەکەی بەتاڵە، چوونکە شتێکی ئەنجام نەداوە کە فەرمانی پێ کراوە. پەسنکردنی خودا بە بەرزی و شکۆمەندی لەم دۆخەدا لەوپەڕی گونجاویدایە بۆ دۆخی ئەو کەسەی سوجدەی بردووە کە ڕوخساری نەوی کردووە بۆ خودا، لە کاتی کەوتنیدا باسی بەرزیی پەروەردگاری دەکات، وەک چۆن لە کاتی ملکەچبوونی لە ڕکوعدا باسی مەزنیی پەروەردگاری کرد و پاک ڕای گرت لە هەموو ئەو شتانەی شایستە نییە پێی کە دژی مەزنی و بەرزییەکەیەتی.

---

(١) رواه أبو داود (٨٦٩) وهو حديث حسن

## دانیشتن لەنێوان سوجدەکاندا

کە سوجدەبردن دوو جارە، هەر بۆیە پێویست بوو شتێک هەبێت لەنێوان دوو سوجدەکەدا، بە ڕوکنێکی ئامانجدار جیا کرانەوە، ئەو دوعایەشی تێدا دانراوە کە شایستەیە پێی و بۆی گونجاوە، بەندە داوای لێخۆشبوون و ڕەحمەت و هیدایەت و ئاسوودەیی و ڕۆزی دەکات[١]، داوا دەکات دوور بێت لە شەڕی دونیا و قیامەت، ڕەحمەت دەبێتە مایەی خێر بۆی، لێخۆشبوونیش دەتپارێزێت لە شەڕ، هیدایەتیش دەتگەیەنێت بەمە و بەوە، ڕۆزییش جەستەت ڕاوەستاو دەکات لە خواردن و خواردنەوە، دڵ و ڕوح ڕاوەستاو دەکات لە زانست و ئیمان، ئەم دانیشتنەی داناوە بۆ ئەو دوعایە لەبەر ئەو ڕەحمەت و ستاییشکردن و ملکەچبوونەی تێیدایە، ئەمەش ئامرازێکە بۆ دوعاکەر و لە ڕێیەوە داوای پێویستییەکەی بکات.

ئەم ڕوکنە دوعا تێیدا ئامانجە، ڕوکنێکە بۆ ئەوە دانراوە داوای لێبوردن و لێخۆشبوون و ڕەحمەت بکات، بەندە کە لە بەردەم خودادا وەستا و سوپاس و ستاییشی خودای کرد، دواتر بەملکەچییەوە چووە ڕکوع و پەروەردگاری بە پاک ڕاگرت و بە گەورەی دانا، دواتر گەڕایەوە بۆ سوپاس و ستاییشکردنی، دواتر ئەوە تەواو دەکات بەوپەڕی زەلیلبوون و ملکەچبوون و نەویبوون، ئیدی کاتی ئەوە دێت داوای پێویستییەکەی بکات و داوای لێبوردن بکات، بۆی دانراوە وەک خزمەتکار بێت، وەک بەندەیەکی زەلیل دابنیشێت دەستەوئەژنۆ وەک ئەو کەسەی خۆی خستۆتە بەردەم گەورەکەی ئومێد و ترسی بەوە و داوای لێبوردنی لێ دەکات، هەتا یارمەتیی بدات لەسەر نەفسەکەی

---

(١) دوعاکە بەم جۆرەیە: اللَّهمَّ اغفِرِ لِي وارحَمني واجبُرني واهدِني وارزُقني. (وەرگێر)

کە فەرماندەرە بە خراپە، دواتر دووبارەبوونەوەی ئەم بەندایەتییەی بۆ دانراوە، جار لەدوای جار هەتا چوار تەواو دەکات، وەک چۆن دەتوانێت جار لەدوای جار زیکرەکە بڵێتەوە، چوونکە باشترە بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکەی، باشتریشە بۆ ملکەچی و ملدان.

## دانیشتنی تەحیات

کە وەستان و قورئانخوێندن و ڕکوع و سوجدە و زیکرەکانی تەواو کرد، بۆی دانراوە لە کۆتایی نوێژەکەیدا دەستەوئەژنۆ دابنیشێت وەک دانیشتنی کەسێکی ملکەچی زەلیلی داماو، لەم دانیشتنەیدا کامڵترین سڵاو دەکات، هەروەها باشترین لەو سڵاوەی کە مرۆڤەکان لە یەکتری دەکەن کە دەگەن بە یەکتری یان دەچنە لای یەکتری، مرۆڤەکان بە جۆرەها شێواز سڵاو لە پاشا و گەورەکانیان دەکەن، هەندێکیان دەڵێن: بەیانیت باش، هەندێکیان دەڵێن: مانەوە و نیعمەت بۆ تۆ، هەندێکیان دەڵێن: خودا مانەوەت درێژ بکات، هەندێکیان دەڵێن: هەزار ساڵ بژیت، هەندێکیان سوجدەی بۆ دەبەن، هەندێکیان سڵاوی لێ دەکەن، سڵاوکردنی نێوانیان ئەوە لەخۆی دەگرێت کە سڵاوکەرەکە حەزی پێیەتی لە قسەکردن و کردەوە، موشریکەکانیش سڵاو لە بتەکانیان دەکەن.

حەسەن دەفەرمووێت: ئەهلی جاهیلی دەستیان دەهێنا بە بتەکانیاندا و دەیانوت: ژیانت بەردەوام بێت، کە ئیسلام هات، فەرمانیان پێ کرا پاکترین و باشترین و جوانترین سڵاوەکان دابنێن بۆ خودا.

## تەحیات

تەحیات سڵاوکردنی بەندەیە بۆ ئەو زاتەی کە زیندووە و نامرێت، خودا لە هەمووان لەپێشترە بەو سڵاوکردنە، ژیان و مانەوە و بەردەوامیی لەخۆ گرتووە، هیچ کەسێکیش شایستەی ئەوە نییە، ئیللا ئەو زاتە نەبێت کە زیندووە و دەمێنێتەوە نامرێت و موڵکەکەی ناڕوات، هەروەها وشەی: (الصلوات)، هیچ کەسێکیش شایستەی ئەوە نییە ئیللا خودا نەبێت، نوێژکردن بۆ غەیری ئەو، گەورەترین کوفر و شیرکە، هەروەها (الطيبات) سیفەتی وەسفکراوێکی مەحزوفە، واتە: گوفتار و ڕەفتار و پەسن و ناوی پاک و جوان هەر بۆ خودایە، ناوەکانی پاک و جوانە، تەنها شتی پاکی لێ وەدەر دەکەوێت، تەنها پاک بەرز دەبێتەوە بۆ لای، تەنها پاک لێی نزیک دەبێتەوە، هەمووی پاکە، تەنها قسەی پاک بەرز دەبێتەوە بۆ لای، کردەوەکانی پاکە، کردەوەی پاکیش بەرز دەبێتەوە بۆ لای، هەموو پاکەکان بۆ ئەوە و دەدرێتە پاڵی، لەوەوە دەر دەچێت و لەلای ئەو کۆتایی پێ دێت.

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (خودا پاکە و تەنها پاکیش وەر دەگرێت)[١]، یان فەرموویەتی: (تۆ پەروەردگاری پاکەکانیت)[٢]، تەنها بەندە پاکەکانی دراوسێیەتیی دەکەن، وەک چۆن لە بارەی ئەهلی بەهەشتەوە دەفەرموێت:

﴿ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ طِبۡتُمۡ فَٱدۡخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴾[٣]

---

(١) رواه مسلم (١٠٥١) في الزكاة: باب قبول الصدقة من الكسب الطيب و تربيتها.

(٢) أبو داود (٣٨٩٢) في الطب: باب كيف الرقى.

(٣) سورة الزمر، الآية: ٧٣

خودا پاکەکانی بۆ پاکەکان داناوە، کە خودا بەڕەهایی پاکە، قسەی پاک و کردەوەی پاک و پەسن و ناوی پاک هەمووی بۆ ئەوە، تەنها شایستە بە ئەوە، بەڵکوو هیچ شتێک پاک نابێت بە پاکیی ئەو نەبێت، پاکییەکانی جگە لە ئەو شوێنەواری پاکیی خۆیەتی، ئەم سڵاوە پاک و جوانە تەنها بۆ ئەو دەبێت.

## السَّلامُ على النَّبيِّ ﷺ و على عبادِ اللّٰهِ الصَّالحينَ

لە تەحیاتدا موسڵمان دوعا دەکات بۆ ئەو کەسەی سڵاوی لێ دەکات، وەک ئەوەی خودا داوای لێ دەکات سڵاو بکات لەو بەندانەی کە تایبەتی کردوون بە بەندایەتیکردنی، ڕازی بووە پێیان بۆ خۆی، دانراوە سەرەتا بە بەڕێزترین و خۆشەویستترین و نزیکترین کەس لێوەی دەست پێ بکات، دواتر شایەتومان بهێنێت کە کلیلی ئیسلامە.

دانراوە کە شایەتومان کۆتایی نوێژ بێت، بە (اللەاکبر) و سوپاس و ستاییشکردن و تەوحیدی ڕبوبیەت و ئولوهیەت دەستی پێ کرد، بە شایەتومانیش کۆتایی پێ هێنا، گەر نوێژەکەی چوار ڕکاتی بێت، لە ناوەڕاستی نوێژەکەیدا تەحیاتی بۆ دانراوە کە وەک دانیشتنی نێوان دوو سوجدەکە وایە، وەک پشوویەک وایە بۆ نوێژخوێنەکە بۆ ئەوەی دوو ڕکاتی کۆتایی بە چالاکی و هێزەوە ئەنجام بدات، هەر بۆیە لە سوننەتدا باشتر وایە دوو ڕکات-دوو ڕکات بێت، گەر چوار ڕکاتیش بوو، لە ناوەڕاستی نوێژەکەدا دادەنیشێت.

## سەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەری خودا ﷺ

وشەکانی تەحیات کە لە کۆتایی نوێژدایە، وەک خوتبەی حاجە وایە، نوێژخوێن کە لە نوێژەکەی تەواو دەبێت، دادەنیشێت وەک دانیشتنی کەسێک کە بەئومێد و بەترسە و داوا لە پەروەردگاری دەکات، وشەکانی تەحیات وەک پێشەکییەک بۆ ئەم داواکردنە دانراوە، دواتر سەڵاوات دەدات لەسەر ئەو زاتەی کە لەسەر دەستی ئەو ئوممەتەکەی تووشی ئەم نیعمەتە بوون، وەک ئەوەی نوێژخوێن تەوەسولی کردووە بۆ لای خودا بە بەندایەتیکردنەکەی، دواتر بە ستاییشکردنی و گەواهیدانی بەوەی تاک و تەنهایە و موحەممەد پێغەمبەری خودایە ﷺ، دواتر سەڵاواتی داوە لە دیداری، پاشان پێی وتراوە: چ دوعایەکت پێ خۆشە ئەوە بکە، ئەمە ئەو مافەیە لەسەرتە، ئەمەیش ئەو مافەیە کە هەتە، دانراوە لەگەڵ سەڵاواتدانا، سەڵاواتیش لەسەر ئالەکەی بدرێت، وەک تەواوکارییەک بۆ چاوگەشبوونی بە ڕێزگرتن لە ئالەکەی و سەڵاواتدان لەسەریان، هەروەها دانراوە سەڵاوات بدات لەسەر خۆی و ئالەکەی، وەک چۆن سەڵاواتی دا لەسەر ئیبراهیم و ئالەکەی.

هەموو پێغەمبەرانی دوای ئیبراهیم بە ئالی ئیبراهیم هەژمارن، هەر بۆیە ئەوەی داوا کراوە سەڵاواتێک لەسەر پێغەمبەری خودا بدرێت وەک سەڵاواتدان لەسەر ئیبراهیم و هەموو پێغەمبەرانی دواتری و ئالە باوەڕدارەکەی، هەر بۆیە ئەم سەڵاواتە باشترین و تەواوترین جۆری سەڵاواتدانە لەسەر پێغەمبەری خودا[1].

---

(١) سەڵاواتەکە بەم جۆرەیە: اللَّهمَّ صَلِّ على محمَّدٍ وعلى آلِ محمَّدٍ، كما صلَّيتَ على إبراهيمَ وعلى آلِ إبراهيمَ؛ إنَّك حَميدٌ مَجيدٌ. اللَّهمَّ بارِكْ على محمَّدٍ وعلى آلِ محمَّدٍ، كما بارَكْتَ على إبراهيمَ وعلى آلِ إبراهيمَ؛ إنَّك حميدٌ مجيدٌ. (وەرگێڕ)

## خۆپاراستن لە کۆکەرەوەی هەموو شەڕەکان

لەدوای سەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەری خودا، فەرمانی پێ کراوە پەنا بگرێت بە خودا لە کۆکەرەوەی هەموو خراپییەکان[١]، چوونکە خراپە یان سزایە لە قیامەتە، یان هۆکارە بۆی، خراپە دەبێتە هۆی سزادان و هۆکارە بۆی، سزایش دوو جۆرە: سزای بەرزەخ و سزای دۆزەخ، هۆکارەکانیشی: فیتنەیە، کە دوو جۆرە: گەورە و بچووک، گەورەکە فیتنەی دەجال و فیتنەی مردنە، فیتنەی بچووکیش فیتنەی ژیانە، کە فریای تەوبەکردن دەکەویت لێی، بە پێچەوانەی فیتنەی مردن و فیتنەی دەجال، ئەو کەسەی گیرۆدەی بووە فریای تەوبە ناکەوێت.

---

(١) دوعاکە بەم شێوەیەیە: اللَّهُمَّ إنِيِّ أَعُوذُ بِكَ مِن عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَمِنْ عَذَابِ القَبرْ، وَمِنْ فِتْنَةِ المَحْيَا وَالمَمَاتِ، وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ المَسِيحِ الدَّجَّالِ. (وەرگێڕ)

## دوعاکردن پێش سڵاودانەوە

دواتر بۆی دانراوە ئەو دوعایانە بکات کە خێری دونیا و قیامەتی تێدایە، دوعاکردن لەم کاتەدا باشترە لە دوعاکردن لەدوای سەلامدانەوە، هەروەها بەسوودتریشە بۆ کەسەکە، هەموو دوعاکانی پێغەمبەری خودا ﷺ بەم شێوەیە بوو، هەمووی لە نوێژدا بوو لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی، لە دەستپێکی نوێژدا چەند جۆرێک دوعای دەخوێند، لە ڕکوع و دوای هەستانەوە لێی، لە سوجدەبردن و لەنێوان دوو سوجدەکەدا، لە تەحیاتدا پێش سەلامدانەوە، ئەبوبەکری فێری دوعایەک کرد کە لە نوێژدا بیخوێنێت، دوعایەکی فێری (حەسەنی کوڕی عەلی) کرد، هەتا لە قنوتی ویتردا بیخوێنێت، گەر دوعای بۆ قەومێک بکردایە یان دوعای لێ بکردنایە، دەیخستە دوای ڕکوعەوە، چوونکە نوێژخوێن پێش سڵاودانەوە موناجات لەگەڵ خودادا دەکات و لە بەردەمیدا وەستاوە، لەم دۆخەدا لە وەڵامدانەوەی داواکارییەکانی نزیکترە هەتا دواتر کە لە نوێژەکەی سەلامی داوەتەوە.

پرسیار کراوە لە پێغەمبەری خودا ﷺ: (أيُّ الدعاءِ أسمَعُ قال جَوفَ الليلِ الآخِرِ ودُبُرَ الصلواتِ المكتوباتِ)

واتە: چ دوعایەک بەزوویی وەڵام دەدرێتەوە؟ فەرموویەتی: (شەونوێژ و دوای نوێژە فەرزەکان)[1]. لێرەدا (دُبُر) واتە بەشی کۆتایی، هەندێ جاریش (دُبُر) بە واتای دوای کۆتاییهاتنی دێت، بەپێی ئەم بەڵگەیە: پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (مَن سبَّح في دُبُر كلِّ صلاة ثلاثًا وثلاثين، وحمد الله ثلاثًا ثلاثين، وكبَّر الله ثلاثًا وثلاثين...)

---

(١) رواه الترمذي و حسنه (٣٤٩٤)

واتە: (هەرکەسێک لەدوای نوێژ سیوسێ جار الله أکبر و سیوسێ جار سبحان الله و سیوسێ جار الحمد لله بکات...) لێرەدا (دُبُر) واتە تەواوبوون لێی، ئەمە وەک کۆتاییهاتنی ماوەکەیەتی، مەبەست لێی تەواوبوونە لێی...

دواتر نوێژەکەی بە سەلامدانەوە کۆتایی پێ دەهێنێت و بەمە لە نوێژەکە دەر دەچێت، ئەم کۆتاییپێهێنانە دوعای پێشنوێژە بە سەلامەتی و ئاشتی بۆ نوێژخوێنەکانی دواوەی، کە بنچینەی هەموو چاکەیەکە، دواتر نوێژخوێنیش هەمان شت دووبارە دەکاتەوە و سەلامی نوێژەکەی دەداتەوە.

لەمەدا دوعای سەلامەتییە بۆ خۆی و نوێژخوێنەکان، هیچ شتێک هێندەی ئەمە جوان و باش نییە بۆ کۆتاییهێنان بە نوێژ، وەک چۆن هیچ شتێک هێندەی الله اکبر بۆ چوونەناو نوێژ چاک و باش نییە، تەکبیرەی ئیحرام بەگەورەدانانی خودایە لەگەڵ جێگیرکردنی هەموو کامڵییەک بۆی، پاکڕاگرتنی لە هەموو کەموکورتییەک و نەنگییەک، بەتاکدانان و تایبەتکردنی بە ئەو، بەگەورەدانان و بەشکۆدانانی، (اللهأکبر)ی ئیحرام هەموو وردەکارییەکانی نوێژی لەخۆ گرتووە لە شێواز و گوفتار و ڕەفتاری.

نوێژ لە سەرەتایەوە هەتا کۆتاییەکەی وردەکاریی ناوەرۆکی: (اللهأکبر)ە، چ تەحریمێک باشترە لەم تەحریمە کە ئیخلاس و تەوحیدی لەخۆ گرتووە؟ ئەم کۆتاییپێهێنانە چاکبوونی بەرامبەر برا ئیماندارەکانی لەخۆ گرتووە. بە ئیخلاس دەستی پێ کرد و بە ئیحسان کۆتایی پێ هێنا.

## پەیامی ئیبن قەییم بۆ یەکێک لە هاوڕێکانی

لەم دونیایەدا نوێژ نوری دیدەی خۆشەویستانە، بە هۆی ئەو موناجاتەی تێیدایە لەگەڵ ئەو زاتەی چاوەکان گەش نابن و دڵەکان ناسرەون و دەروونەکان ئارام نابن ئیللا بەو نەبێت، لەزەتبینین بە ناوهێنانی و زەلیلبوون و ملکەچبوون بۆی و نزیکبوونەوە لێی، بەتایبەت لە کاتی سوجدەدا، کە بەندە لە هەموو کات زیاتر لە خودا نزیکە.

پێغەمبەری خودایش ﷺ فەرموویەتی: (ئەی بیلال، ئاسوودەمان بکە بە بەرپاکردنی نوێژ)[1] ئاسوودەییەکەی لە نوێژدا بوو، وەک چۆن نوری دیدەیشی هەر لە نوێژدا بوو. ئەمە لەکوێ و قسەی ئەو کەسە لەکوێ کە دەڵێت: با نوێژەکەمان بکەین و ئیسراحەت بکەین لەدەستی.

خۆشەویست ئاسوودەیی و نوری دیدەی لە نوێژدایە، کەسی بێئاگا و پشتهەڵکەر لەمەدا هیچ بەشێکی نییە، بەڵکوو نوێژ قورس و گرانە لەسەری، کە نوێژ دەکات هەتا تەواو دەبێت لێی وەک ئەوە وایە لەسەر پشکۆیەک

---

(١) رواه أبو داود (٤٩٨٥)

بێت، خۆشەویستترین نوێژ لەلای ئەو نوێژەیە کە زۆر بەخێرایی تەواو دەبێت، چوونکە نوێژ نوری دیدەی نییە و ئاسوودەیی نییە بۆ دڵی، بەندە گەر چاوی بە شتێک گەش بێت و دڵی پێی ئاسوو دەبێت، جیابوونەوەی بە سەخت دەزانێت و سەختە بەلایەوە، ئەو کەسەیشی دڵی بەتاڵە لە خودا و ڕۆژی دوایی و دونیای لەلا خۆشەویستە، سەختترین شت بەلایەوە نوێژە و ئەوەی بەلایەوە ناخۆشە نوێژی درێژە، هەرچەندە کاتی زۆرە و تەندروستە و سەرقاڵ نییە.

پێویستە بزانرێت ئەو نوێژەی چاو پێی گەش دەبێت و دڵ پێی ئاسوودە دەبێت، ئەو نوێژەیە کە شەش دیمەنی لەخۆ گرتووە:

## دیمەنی یەکەم: ئیخلاس:

ئەویش بەوجۆرەیە پاڵنەر و هاندەری بۆ نوێژکردن، ئارەزوو و ویستی بەندە بێت بۆ خودا، خۆشەویستی بێت بۆی، داوای ڕازیبوون و خۆخۆشەویستکردن بێت لەلای، گوێڕاڵیکردنی فەرمانەکەی بێت، بە جۆرێک پاڵنەر و هاندەرەکەی هیچ بەشێک لە بەشەکانی دونیای تێدا نەبێت، بەڵکوو تەنها لە پێناو خودای گەورەدا ئەنجامی بدات، وەک خۆشەویستییەک بۆی و ترسان لە سزاکەی و ئومێدبوون بە لێخۆشبوون و پاداشتەکەی.

## دیمەنی دووەم: دیمەنی ڕاستگۆیی و ئامۆژگاری:

ئەویش ئەوەیە دڵی خاڵی بکاتەوە بۆ خودا، هەموو تواناکانی لە ڕووکردنە خودادا بەگەڕ بخات و دڵی لەسەر ئەوە جەم بکاتەوە، بە جوانترین و کامڵترین شێوە پێشکەشی بکات، بە ڕواڵەت و ناوەرۆکیەوە، نوێژ ڕواڵەت و ناوەرۆکی هەیە، ڕواڵەتەکەی بریتییە لە: ئەو کردەوانەی کە دەبینرێت و ئەو وتانەی دەبیسترێت، ناوەرۆکەکەی بریتییە لە: ملکەچی و هەستکردن بەوەی خودا چاودێرە، بەتاڵکردنەوەی دڵ بۆ خودا و ڕووتێکردنی بە هەموو بوونتەوە، بە جۆرێک دڵ ئاوڕ نەداتەوە بۆ هیچ شتێکی تر، ئەمە وەک ڕوح وایە بۆی، کردەوە و جووڵەکانیشی وەک جەستە وان، کە بێڕوح بێت وەک جەستەی بێڕوح وایە.

ئەری بەندە شەرم ناکات بە شتێکی ئاواوە ڕوو بکاتە گەورەکەی، هەر بۆیە پۆشاکی کەسەکە دەگرێت و دەیداتەوە ناوچاوی کەسەکەدا و پێی دەڵێت: خوا بە زایەت بدات وا منت بە زایە دا، ئەو نوێژەیشی کە ڕواڵەت و ناوەرۆکی کامڵ بووە، بەرز دەبێتەوە و نور و بەڵگەی هەیە، ڕووناکییەکەی وەک خۆر وایە هەتا دەگاتە لای خودا، ڕازی دەبێت و قبوڵی دەکات و دەڵێت: خودا بتپارێزێت، وەک چۆن منت پاراست[١].

---

(١) فەرموودەکە لاوازە.

## دیمەنی سێیەم: دیمەنی شوێنکەوتن و پەیڕەوکردن:

ئەویش بەو جۆرە دەبێت کە تەواوی هەوڵی خۆی بدات کە لە نوێژەکەیدا شوێنی پێغەمبەری خودا بکەوێت و نوێژ بکات، وەک چۆن ئەو نوێژی کردووە، پشت بکات لەو شتانەی خەڵکی دایان هێناوە لە نوێژدا لە زیادکردن و کەمکردن و ئەو جووڵانەی کە هیچ شتێکی لە پێغەمبەری خودا و هاوەڵەکانی نەگێڕدراوەتەوە، هەروەها لەلای قسەی مۆڵەتدەرەکان نەوەستێت و گوێڕایەڵییان نەکات -ئەوانەی زۆر بەدوای ئاسانکارییەوەن- بەم هۆیەوە واز لە چەندین شت بهێنێت کە زۆر لەوانە واجبترە کە ئەنجامی داوە. لەوەیە فەرموودەی جێگیر و سوننەتێکی پێغەمبەری خودا ﷺ بخاتە لاوە و ئاوڕی بۆ نەداتەوە و بڵێت:

ئێمە شوێنکەوتووی مەزهەبی فلانە کەسین. ئەمە کەسێکی موخلیس نییە لەلای خودا و عوزریش نییە بۆ ئەو کەسەی سوننەتی پشتگوێ خستووە، چوونکە خودا فەرمانی کردووە گوێڕایەڵیی پێغەمبەرەکەی ﷺ بکەین و تەنها شوێنی ئەو بکەون، فەرمانی بە شوێنکەوتنی کەسی تر نەکردووە، لە دەمێکدا گوێڕاڵیی غەیری ئەو دەکرێت کە فەرمان بکات بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردووە، جگە لە پێغەمبەری خودا ﷺ قسەی وەر دەگیرێت و ڕەت دەکرێتەوە.

## دیمەنی چوارەم: دیمەنی ئیحسان:

ئەمەیش دیمەنی چاودێریکردنە، خودا بپەرستێت وەک ئەوەی دەیبینێت، ئەم دیمەنە لە باوەڕبوونێکی کامڵەوە دێت بە خودا و ناو و پەسنە بەرزەکانی، هەتا وەک ئەوەی خودا دەبینێت لەسەرووی ئاسمانەکانیەوە، لەسەر عەرشەکەیەتی، فەرمان و ڕێگری دەر دەکات، کارەکانی بوونەوەر بەڕێوە دەبات، فەرمانەکان لەوەوە دەر دەچن و دەگەڕێنەوە بۆ لای، کردەوەی بەندەکانی پێشان دەدرێت لەگەڵ ڕوحیان لەو دەمەی دەمرن، هەموو ئەمانە بە دڵی دەیبینێت و ناو و پەسنە بەرزەکانی دەبینێت، سەرپەرشتیارێکی زیندووی بینەری بیسەری دانای بەدەسەڵات دەبینێت، کە فەرمان دەر دەکات و ڕێگری دەکات، خۆشی دەوێت و دەبوغزێنێت، ڕازی دەبێت و توورە دەبێت، ویستی لە چی بێت ئەنجامی دەدات، چ بڕیارێکی بوێت ئەوە دەدات، لەسەر عەرشەکەیەتی و هیچ کردەوەیەکی بەندەکانی لێ شاراوە نییە، هەروەها قسەکانیان و ئەوەیشی لە ناخیاندایە، بەڵکوو خیانەتی چاوەکان و ئەوەی لە سینەدا شاراوەتەوە دەزانێت.

دیمەنی ئیحسان بنەڕەتی هەموو کارەکانی دڵە، دەبێتە مایەی شەرمکردن و بەگەورەدانان و ترس و خۆشەویستی و گەڕانەوە و پشتپێبەستن و ملکەچبوون و زەلیبوون بۆ خوای گەورە، دەبێتە هۆی بڕینی وەسوەسە و گفتی دەروون، دڵ و هەموو خەمت خودای گەورە دەبێت. بەشی بەندە لە نزیکبوونی لە خودا بە ئەندازەی بەشبوونیەتی لە ئیحسان، بە هۆی ئیحسانەوە نوێژی بەندەکان جیاوازیی هەیە هەتا فەزڵی نێوان دوو نوێژخوێن، وەک نێوانی ئاسمان و ڕێسمانی لێ دێت، لە دەمێکدا وەستان و ڕکوع و سوجدەیان وەک یەکە.

### دیمەنی پێنجەم: دیمەنی منەت:

گەواهی بدات کە فەزڵ و منەتەکە بۆ خودایە کە ئاوا لەو پێگەدا وەستاندوویەتی و بە شایانی زانیوە و مۆفەقی کردووە بە دڵ و جەستەی لە خزمەتیدا بوەستێت، گەر خودا نەبووایە، هیچ یەکێک لەوانە نەدەبوو، وەک چۆن هاوەڵان لە کاتی هەڵکەندنی خەندەقدا دەیانفەرموو:

وَاللَّهِ لَوْلَا أَنْتَ ما اهْتَدَيْنَا ... وَلَا تَصَدَّقْنَا وَلَا صَلَّيْنَا

وەڵلاهی گەر تۆ نەبوویتایە هیدایەتمان وەر نەدەگرت،

نە خێر و چاکەمان دەکرد، نە نوێژمان ئەنجام دەدا.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُواْ قُل لَّا تَمُنُّواْ عَلَىَّ إِسْلَٰمَكُم بَلِ ٱللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَىٰكُمْ لِلْإِيمَٰنِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾[١]

واتە: ئەوانە منەت دەکەن بەسەر تۆدا کە گوایە موسڵمان بوون، پێیان بڵێ: منەت مەکەن بەسەرمدا لەسەر موسڵمانبوونەکەتان، بەڵکوو خوا منەت دەکات بەسەر ئێوەدا کە هیدایەتی داون بۆ ئیمان و باوەڕ، ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن.

ئەوە خودایە موسڵمانی کردووە بە موسڵمان و نوێژخوێنی کردووە بە نوێژخوێن، وەک چۆن ئیبراهیم فەرمووی: ﴿رَبَّنَا وَٱجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ﴾[٢]

---

(١) سورة الحجرات، الآية: ١٧

(٢) سورة البقرة، الآية: ١٢٨

واتە: پەروەردگارا، هەردووکمان وا لێ بکە تەنها فەرمانبەردار و ملکەچی تۆ بین و لە نەوەکانیشمان ئوممەتێکی موسوڵمان و فەرمانبەردار بۆ خۆت فەراهەم بهێنە.

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿رَبِّ ٱجۡعَلۡنِي مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِيۚ﴾(١)

واتە: پەروەردگارا،

خۆم و نەوەکانم بگێڕە لەو کەسانەی کە ئەنجامدەری نوێژ بین بەچاکی.

منەت تەنها بۆ خودایە کە وای لە بەندەکەی کردووە گوێڕایەڵیی بکات، ئەمەیش گەورەترین نیعمەتە بۆ بەندەکە، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَمَا بِكُم مِّن نِّعۡمَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِۖ﴾(٢)

واتە: هەرچیی نازونیعمەتێکتان هەیە هەمووی بەهرە و بەخششی خودایە.

دەفەرمووێت: ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِي قُلُوبِكُمۡ وَكَرَّهَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡكُفۡرَ وَٱلۡفُسُوقَ وَٱلۡعِصۡيَانَۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ﴾(٣)

واتە: بەڵام خودا ئیمان و باوەڕی لەلا خۆشەویست کردوون و لە دڵ و دەروونتاندا ڕازاندوویەتیەوە، لەولایشەوە کوفرو بێباوەڕی و تاوان و یاخیبوون لە فەرمانی خودای لا تاڵ و ناشیرین کردوون، ئا ئەوانە هەر خۆیان ڕێگەی ژیری و سەرفرازییان گرتۆتە بەر.

---

(١) سورة إبراهيم، الآية: ٤٠

(٢) سورة النحل، الآية: ٥٣

(٣) سورة الحجرات، الآية: ٧

ئەم دیمەنە مەزنترین دیمەنە و لە هەموو دیمەنەکان زیاتر سوودی بۆ بەندە هەیە، هەتا زیاتر تەوحیدی مەزنتر و تەواوتر بێت، پشکی لەم دیمەنەدا مەزنتر و تەواوتر دەبێت، چەندین سوودی تێدایە بۆی:

١. دڵی دوور دەبێت لەوەی سەرسام بێت بە کردەوەکان و هەمیشە لە بەرچاوی بێت، چوونکە گەر گەواهیی ئەوەی دا کە خودا منەتباریەتی و مۆفەقی کردووە بۆ ئەو کارە و هیدایەتی داوە بۆی، ئەوا دیمەنی ئەوە سەرقاڵی دەکات بەوەی سەرسام بێت بە کارەکەی و لەناو خەڵکیدا باسی بکات، ئیدی لە دڵی بەرز دەبێتەوە و پێی سەرسام نابێت، لەسەر زاری نامێنێت و منەتی پێوە ناکات، ئەمە پێگەی کردەوەیەکە کە بەرز دەبێتەوە و وەر گیراوە.

٢. یەکێکی تر لە سوودەکانی ئەوەیە سوپاسی ئەو زاتە دەکات کە شایانی سوپاسکردنە، گەواهیی سوپاسکردن بۆ دەروونی خۆی نادات، بەڵکوو گەواهیی ئەوە دەدات هەموو سوپاسێک بۆ خودایە، وەک چۆن گەواهی دەدات هەموو نیعمەتێک لەوەوەیە و هەموو فەزڵێک بۆ ئەوە و هەموو چاکەیەک بەدەست خۆیەتی.

ئەمەیش لە تەواوێتیی تەوحیدە، پێیەکانی لە پێگەی تەوحیددا جێگیر نابێت هەتا ئەوە نەزانێت و گەواهیی بۆ نەدات، کە زانی و ڕۆ چوو تێیدا، دیمەنێکی بۆ پەیدا دەبێت، کە دیمەنێکیش بۆ دڵی پەیدا بوو، بەرهەمێکی بۆ دەگرێت لە خۆشەویستی و شادومانبوون بە خودا و تامەزرۆبوون بۆ دیداری و چێژوەرگرتن بە ناوهێنان و گوێڕایەڵیکردنی، کە هەرگیز بەراورد ناکرێت لەگەڵ بەرزترین نیعمەتی دونیادا، ژیانی مرۆڤ چ خێرێکی تێدایە گەر دڵی بە ڕووی ئەوەدا داخراو بێت، ڕێگای گەیشتن پێی داخراو بێت، بەڵکوو وەک ئەوانە دەبێت کە خوای گەورە لە

بارەیانەوە دەفەرموویێت: ﴿ذَرۡهُمۡ يَأۡكُلُواْ وَيَتَمَتَّعُواْ وَيُلۡهِهِمُ ٱلۡأَمَلُۖ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ﴾[١]

واتە: جارێ وازیان لێ بهێنە با بخۆن و ڕابوێرن و هیوا و ئاواتیان سەرگەرم و بێئاگایان بکات، سەرەنجام خۆیان دەبیننەوە چییان بەسەر دێت.

## دیمەنی شەشەم: دیمەنی کەمتەرخەمی:

گەر بەندەیەک هەستێت بە ئەنجامدانی کارێک و ئەوپەڕی توانای خۆی تێیدا خەرج بکات، هێشتا کەمتەرخەمە و مافی خودا بەسەریەوە زۆر مەزنترە، ئەوەی لەسەری پێویستە، تاعەت و بەندایەتی و خزمەتی زۆر زیاتر لەوە پێشکەش بکات، گەورەیی و شکۆمەندیی خودای گەورە بەندایەتییەک دەخوازێت کە شایستەبێت پێی، کە خزمەتکار و کۆیلەکانی پاشاکان لە خزمەتی پاشاکانیانن، بە گەورەدانان و ڕێزگرتن و دڵسۆزی و شەرم و ترس و هەیبەتەوە، بە جۆرێک دڵ و جەستەیان تەرخان دەکەن بۆیان، پاشای پاشاکان و پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی زۆر لەپێشترە ئاوا مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، بەڵکوو بە چەند هێندە زیاتریش، کە بەندە گەواهیی ئەوە دەدات بەتەواوەتی مافی بەندایەتیی نەداوە و نزیک نەبووەتەوە لە مافەکەی، کەمتەرخەمیی خۆی دەزانێت، لەگەڵ ئەمەیشدا تەنها دەتوانێت داوای لێخۆشبوون بکات و داوای لێبوردن بکات لە کەمتەرخەمییەکەی و هەڵنەستانی بەوەی پێویستە لەسەری، پێویستی بەوەیە خودا لێی خۆش ببێت

---

(١) سورة الحجر، الآية: ٣

لەسەر بەندایەتیکردنەکەی و لێی ببورێت، زیاتر لەوەی پێویستی بەوە بێت داوای پاداشتی لێ بکات، ئەمە ئەگەر مافی خۆی پێ بدایە وەک ئەوەی پێویستە، ئەوا مافێکە لەسەری بە گوێرەی بەندایەتی، چوونکە بەندەی ئەوە، کردەوە و خزمەتی بەندە بۆ گەورەکەی مافێکە لەسەری، چوونکە بەندەی ئەوە، گەر داوای پاداشت بکات لەسەر کردەوە و خزمەتەکەی، خەڵکی بە گەمژە و شێت هەژماری دەکەن.

لە حەقیقەتدا بەندەی ئەو نییە، بەڵکوو بەندە و گوێڕایەڵی خودایە لە هەموو ڕوویەکەوە، کردەوە و خزمەتەکەی مافێکە لەسەری، چوونکە بەندەی ئەوە، گەر لەسەری پاداشتی بداتەوە، تەنها فەزڵ و منەت و چاکەی خۆیەتی، نەک بەندە شاییستەی بێت، لێرەدا لە فەرموودەکەی پێغەمبەری خوداﷺ تێدەگەین کە دەفەرمووێت: (کەس بە کردەوەی خۆی ناچێتە بەهەشتەوە)، وتیان: تەنانەت تۆیش ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: (تەنانەت منیش، مەگەر خودا لە ڕەحمەت و فەزڵی خۆیدا غەرقم بکات)[١].

---

(١) متفق عليه من حديث عائشة.

سوپاس بۆ خودا لەدوای دوو مانگ  لە سەرقاڵبوونم بەم کتێبەوە، توانیم بگەم بە کۆتایی و کارەکەم تەواو بکەم، سوپاس بۆ ئیبن قەییم کە کرۆک و ناوەرۆکی نوێژی بۆ ڕوون کردینەوە و فێری ئەوەی کردین کە چێژی نوێژ چۆنە. هیوادارم لە وەرگێڕانەکەدا حەقی خۆیم پێ دابێت و خزمەتێکی بچووکم کردبێت، خوێنەری بەڕێزیش لەدوای خوێندنەوەی چێژ لە نوێژەکانی ببات و نوێژ ببێتە نوری دیدەی، ئامۆژگاریشم ئەوەیە کتێبەکە بەخێرایی نەخوێندرێتەوە، بۆ ئەوەی بەتەواوی پەیامی کتێبەکە بگات.

(براتان: ئەیاد فەهمی سەنگاوی).

# ناوەڕۆك